زنجیرەی
هزری
هاوچەرخی
ئیسلامی
٢٨








# تا نەبیتە بارگرانی
# ڕێگای سەرکەوتنی تۆیە

وەرگێڕانی
سالار محمد قادر

پێداچوونەوەی
نەوزاد محمد سعید

التفسير
١٤٢٥ك هەولێر ٢٠٠٤ز

## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

◆ دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردیە بە گرنگترین وکاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشخەڵی سەرڕێی هزری هاوچەرخی ئیسلامین.

◆ ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسوڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ ڕۆشنبیری ئیسلامیی و سازێنەری بێداریو رابونی ئیسلامیی پیرۆزن.

◆ شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە، ئازادکردنیانە لە گشت کۆت و بەند و بۆچونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەویو رەوتگەرایی.

◆ بناغەیەك بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بەهێز بۆ هەر تاکێکی موسوڵمانی کورد تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆڕانکاریانەی هەبێ کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە.

دەگەڵ رێز و تەقدیرمان بۆ بیروڕای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەمو بیروبۆچونەکانیان بین.

با دەستوریشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت:

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

الفقير

# تا نەبیتە بارگرانی

نوزاد

## رێگای سەرکەوتنی تۆیە

نووسینی

دکتۆر عوض محمد القرنی

وەرگێڕانی

سالار محمد قادر

پێداچوونەوەی

فەوا محمد سعید

التفسير

هەولێر

١٤٢٥ ٢٠٠٤

ناوی کتێب بە عـارەبی: حتى لا تكون كلا
نوسـيـنـی: دكتور عوض محمد القرني
ناوی کتێب بە کـوردی: تا نەبیتە بارگرانی
وەرگـێـرانی: سالار محمد قادر
پێداچونـەوەی: نەوا محمد سعيد
چاپ و بڵاوکردنـەوەی: نوسینگەی تەفسیر/ هەولێر
خـەت: نەوزاد کۆیی
نـۆرە و سـاڵی چـاپ: یەکەم ١٤٢٥ك ٢٠٠٤ز
چـاپکـردن: چاپخانەی پەروەردەی هەولێر
تـیراژ: ٢٠٠٠ دانە
ژمـارەی سـپاردن: ٢١١ ساڵی ٢٠٠٣

تفسير
هەولێر - شەقامی دادگا
ت: ٢٢٢١٦٩٥ـ٢٢٣٠٩٠٨
tafseeroffice@maktoob.com
AlTafseer@hotmail.com

# پێشەکی وەرگێڕ

چۆنیەتی ژیان و هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵك و واقیعدا، هەم زانستە و هەم هونەریشە. زانستە، چونکە یاسا و ڕێسا و بنەما و لێکدانەوە و دەرەنجامکاری تایبەت بە خۆی هەیە و هونەریشە، چونکە ئەو زانستە پێویستە بەشێوەیەکی زیرەکانە و جوان و هونەریانە پەیڕەویان لێبکرێت. ئەم زانست و هونەرەش وەکو زانست و هونەرەکانی تر کاریگەری باڵایان هەیە و هۆیەکی سەرەکین لە دابینکردن و بەرقەرارکردنی ئاسودەیی و دەبنە مایەی وەدیهێنانی ژیانێکی ئارام و پڕ لە تاموچێژ و وا لە مرۆڤ دەکەن لە نرخی ژیان و چۆنیەتی ڕەفتارکردن بگات و خۆی لە دیاردە و هەڵوێستە دژ بە ئاسودەییەکان بپارێزێ و لە سەرێشە و چەرمەسەریە بێهودەکان دورکەوێتەوە و زەمەنی تەمەنە سنوردارەکەی لە کار و هەڵوێستی بێبەرهەم نەکاتە هەڵم و بەهەدەری نەدات.

ئەم زانست و هونەرانە کە بابەتێکی گەلێ بەرفرەوانن و بەسەدان لق و پۆپیان لێدەبێتەوە و تێکەڵ بە گشت بوار و لایەنەکانی ژیانن و بۆ گشت کەسێکن، هەروەها لە هەمو قۆناغەکانی تەمەن و سەرلەبەری حاڵەت و دیاردەکان بەشدارن، کە هەڵبەت لە ئەنجامی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و ئەزمونێکی زۆر و کرد و کۆششێکی گەلێ گەورەی بلیمەت و زیرەك و زانا و پسپۆر و توێژەر و خاوەن ئەزمونەکانەوە وە ئەنجام هاتون، تەنانەت ئامۆژە ئاینیەکان و کلتورێکی مرۆڤانەیی عەقڵنامێزیش بەشدارییەکی گەورەیان لە داڕشتنی ئەم زانست و هونەرەدا هەیە. لێرەدا جێی ئاماژەیە، کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ڕێژەیەکی ئێجگار گەورەی لە بنەما و چۆنیەتی ڕەفتارکردن و چێژوەرگرتن و تێگەیشتن لە ژیان و سود لێوەرگرتنی تێدایە، هەریەك لە ئایەتەکانی قورئان و فەرموودە شیرنەکانی پێغەمبەر ﷺ و وتەی زانا و ناودارانی ئیسلامی بروانێ ئەوجار دەزانێ، کە چ گەنجینەیەکیان لەم بوارەوە تێدایە. بەڵام بەداخەوە نوسەرانی ئیسلامی کەمیان لەم بوارەوە نوسیوە و گەوهەر و مرواریە بە نرخەکان هەر بە پەرش و بڵاوی ماونەتەوە.

* * *

## بەراوردێك لەنێوان كۆمەڵگەی پێشكەوتو و پاشكەوتودا

### ١- خەساربونی ژیان :

لە كۆمەڵگەی پێشكەوتودا كە ئـەم جـۆرە زانسـت و هونەرانـەیان دۆزیوەتـەوە لـە هەڵوێسـت و ڕەفتارەكـاندا بەرجەسـتەیان كـردون و لـە چۆنیـەتی ژیـان گەیشـتون و بیركردنەوەی ڕاست و دروست جەرەقەی[1] مەشخەڵەكانی ژیانیانە؛ كات نرخێكی گـەلێ گەورە و گرنگی هەیە و حیساب بۆ چركەش دەكرێت.

بێگومـان كـات لـە تـەواوی چالاكیـەكانی ژیـاندا فاكتـەرێكی بنچینەییـە و ئیشوكارەكان، ئەگەر لە كاتی دیاریكراو و گونجاوی خۆیاندا ئەنجام نەدرێن ئەوا نوشستی دێنن، هەروەها كات بەفیڕۆدان دەبێتە مایەی بەفیڕۆدانی كرد و كۆششێكی زۆر و مرۆڤ پتر ماندو دەكەن بێنەوەی بەرهەمی هـەبێت. جـا لـەو جـۆرە كۆمەڵگەیـەدا كـات بـە هەوەنتە بەفیڕۆ ناچێت، چونكە سیستەمێك هەیە كات بەڕێوە دەبـات هـەروەها كـرد و كۆش لە شتی بێـهودە و بچـوك و بێبەرهـەم بـەفیڕۆ نـاڕوات، چونكـە لایـەن و بـوار و چۆنیەتیەكانی ژیان ڕێك خراوە و بەرنامەڕێژی بۆ كراوە و گرفتـەكان چارەسـەر كـراون و بەڕێوەچونی ژیان شێوەیەكی تۆماتێكی وەرگرتوە. هەر بۆیەشە لەم كۆمەڵگەیەدا بەرهەم و داهێنان دێنە ئاراوە و شتی گـەورە گـەورە و وەدیـهێنانی گرنـگ و ئاسـودە بـەخش لەدایك دەبن چونكە وەك وتمان كات و كۆشش لەشتی بێهودە سەرف نابن.

بەڵام لە كۆمەڵگەی دواكەوتوودا كە بێبەشن لـەم جـۆرە زانسـت و هونـەرەدا و لـە چۆنیەتی ڕەفتاركردن لەگەڵ ژیاندا نازیرەكن و بنەماكانیان لەنێودا بەرقەرار نەبوە، ئـەوا كات و كۆششێكی زۆریان لە شـتی بێـنرخ یـان لـەو گرفتانـەی كـە دەبوایـە لـەمێژبێ چارەسەر كرابن بەفیڕۆ دەڕوات. هەر بە نمونـە لـە مەسـەلە كارگێڕیـەكاندا كـە كـات و كۆششێكی زۆری هاوڵاتیان بەهۆی دەیان و سەدان ڕۆتینی كارگێڕی بە هەدەر دەچن. یان بەهۆی چارەسەر نەكردنی مەسەلەی ئاو و كارەبا و ڕێگەوبان و پلانـی شـارەوە چـەندین گرفت دروست دەبن كە خەریكبون بـەو گرفتانـە -كـە دەبوایـە لـەمێژ بـێ چارەسـەری

---

١ جەرەقە: شرارة

کرابونایه- ڕێژەیەکی زۆر لە کات و کۆششی خەلکی بەفیڕۆ دەدەن. جا هــەزاران نمونــەی تر هەن. کە هەڵبەت ئەمانەش وادەکەن بەرهەم و داهێنان کەم بن، بەکورتی لــەم جـۆرە ژیانەدا ڕێژەی بەخەسارچونی ژیان زۆرە، ژیان هەرچەندی گرفتی تێدابێ ڕێژەیەکی زیــاتر بەخەسار دەچێ، کە بەهۆی ئەم خەســاربونەوە لــەجێی ئاسـودەییدا بـێزاری و دلتــەنگی لەجێی بەختەوەریشدا بەدبەختی ئامادەیە.

## ٢- ژیان و هەوڵدان بۆ ژیان:

لە کۆمەڵگەی پێشکەوتودا خەڵك دەژین و گەیشتونەتە قۆناغی ژیان و چێژ وەرگرتن و مومارەسەکردنی لایەنە خۆشبەختەکانی ژیــان، چونکــە بنچینــەکانی ژیانیــان تــەواو کردوە و لە چارەسەری گرفتەکان بونەتەوە کە ژیــان بەخەســار دەدەن، بــەم جـۆرە ژیــان گەیشتۆتە حاڵەتی سەقامگیربون و خەڵك بە نەشمێکی سەقامگیرانە دەژین.

بەڵام لە کۆمەڵگەی دواکەوتودا خەڵك هەر لە هەوڵی ئەوەدان کە بژین و بگەنە ئــەو ڕۆژەی کە سەقام گیر بن و دەق بەجۆرە ژیانێکەوە بگرن، کەچی هەر پێی ناگــەن و هــەر لە قۆناغی هەوڵدان بۆ ژیان دەمێننەوە. کە هەڵبەت ئەم هەوڵدانەش بۆ ژیان جۆرێکە لە ژیان بەڵام چ ژیانێك!.. ژیانێکی پڕ واوەیلا و بە ئێش و ئازار و پڕ لە کارەسات و گرفت و دەردەسەری و دور لە ئاســـودەیی و خۆشــی و کامــەرانی. مــرۆڤ لــە کۆمەڵگــەی وا دواکەوتودا لەبەر هەوڵدان بۆ باری بژێوی هیچ کاتێکی ئەوتۆی بــۆ نامێنێتــەوە تــا بــۆ مومارەسەکردنی ژیانێکی بەختەوەرانە تەرخان بکات. بەڵام ئەوەی جێی داخە زۆرینــەی ئەو خەڵکەش کە باری بژێویان ئاستێکی خوازراویشی وەرگرتوە هــەر بەهــەمان نەشــم و شێواز هەنگاو هەڵدەگرن، کە ئەمەش دو لایەنی هەیە، لایەنێك تایبەتە بە خودی خــۆی کە بێبەشە لەو زانست و هونەرانەی لەبارەی ژیانەوە دەدوێن و واتــای خۆشــبەختانە بــۆ ژیان دێننە ئاراوە، لایەنەکەی تریش تایبەتــە بــە کۆمەڵگــە کــە زەمینەیــەکی وای بـۆ مرۆڤەکان نەرەخساندوە تا بەشێوەیەکی خۆشبەختانە بژین و لــە واتــای چۆنیــەتی ژیــان بگەن.

### ٣- فرەوانی و تەسکی ئاسودەیی:

لە کۆمەڵگەی پێشکەوتوودا زەمینە و بوارەکانی چێژ وەرگرتنی ژیان زۆرن و جۆرەهای جۆر بوار و زەمینە داهێنراون تا مرۆڤەکان بتوانن مومارەسەی ژیانی خۆیانیان تێدا بکەن و ئاسودەیی و بەختەوەری تێدا وەدی بێنن.

ئاسودەیی تا ئاسودەیی فەرقی هەیە، ئەو کۆمەڵگە پێشکەوتوەی کە بوارەکانی مومارەسەکردنی ژیانی تێدا زۆرترە ئاسودەترە لەو کۆمەڵگەیەی کە بوارەکانی ژیانی تێدا کەمترە، ئەوەش دەمانگەیەنێتە ئەو دەرەنجامەی کە ئاسودەییش روبەر و فرەوانی و تەسکی هەیە. کەواتە ئەو کۆمەڵگەیە زیرەکانەتر و خۆشبەختانە تر دەژێ، کە داهێنانی زیاتر لە بوارەکانی مومارەسەکردنی ژیان وەدی دێنێ، ئەوکاتە ژیان فرەوانتر دەبێ. هەڵبەت لە نێو ژیانێکی فرەواندا مرۆڤ بەختەوەر دەبێ. یەك لەو خاڵانەی کە خوا لە وەسفی بەهەشت پێمان رادەگەیەنێ بریتیە لە فرەیی لایەنە چێژبەخشەکانی بەهەشت تەنانەت دەفەرموێ هەرچی نەفس حەزی لێیە لەو بەهەشتەدا هەیە. کەواتە لێرەدا جگە لە جۆرێتی چێژەکان فرەیی چێژەکانیش خاڵێکی گەورەی دابینکردنی ئاسودەییە.

بەڵام لە کۆمەڵگەی دواکەوتودا ژیان سنورەکانی تەسك و تەنگن و روبەرێکی بچوکی هەیە لە ئاسودەییدا، یا بەواتایەکی تر بوار و لایەنەکانی مومارەسەکردنی ژیانی تێدا کەمە. کە ئەمەش وادەکات مرۆڤەکان هەست بەناسودەیی نەکەن، بگرە هەست بە بێزاری و خەفەتباریەکی گەورە بکەن بەتایبەتی، ئەگەر ئەو بوارانەشی تێدا نەبێ کە وەك واجب وان بۆ دابینکردنی ئاسودەییە زەروریەکان.. ئەو کاتە ژیان لەو کۆمەڵگەیەدا دەبێتە بەندیخانەیەك بۆ مرۆڤەکان. ئاشکرایە بەندیخانەش هەر بریتیە لە تەسککردنەوەی سنوری مومارەسەکردنی ژیانی بەندییەکان.

### ٤- رێژەی هەڵەکارییەکان:

لە کۆمەڵگەی پێشکەوتودا رێژەی هەڵەکاریەکانی نێو ژیان کەم دەبنەوە و کات و هەوڵ و زەین و هزری تاکەکانی نابنە قوربانی هەڵەکان.

بەڵام لە کۆمەڵگەی دواکەوتودا ژیان یەکپارچە لەسەر هەڵە دامەزراوە، هەڵەکان هۆکاری پەیدابونی هەڵەی ترن و هەڵە هەڵەی تر و ئەویش هەڵەی تری بەدواوە دادێ.

لەم کۆمەڵگەیەدا خەڵك بە هەڵە ژیان بەسەر دەبەن بە هەڵەش ژیانیان کۆتایی دێ.

بە هەڵە مافی دەخورێ، بە هەڵە دەوڵەمەند دەبێ، بە هەڵ دەکوژرێ، بە هەڵە دەعەم دەکات، چونکە شەقامەکان بە هەڵە دروست کراون.

بەهەڵە بوەتە سەرکردە، چونکە میللەت بە هەڵە لە واتای سەرکردە گەیشتوە.

زۆربونی هەڵەکان خزمەت بە نائاسودەبون و بەدبەختبونی کۆمەڵگە دەکات و وا لە تاکەکان دەکات توشی بێزاری و هەراسانی بێن و تام و چێژیان لە ژیاندا کەم بێتەوە. هەروەها لە ئەنجامی هەڵەکانەوە گەلێ دەستکەوتی گەورە لە دەست دەچن و گەلێ کارەسات و گرفتیش بەرپا دەبن.

## ٥- رۆڵی شتە کەم بەهاکان لە پەیداکردنی کارەساتی گەورەدا:

لە کۆمەڵگەی پێشکەوتودا شتە بچوك و کەم بەهاکان نابنە مایەی پەیداکردنی گرفت و کارەساتی گەورە کە ڕەنگە لە سەرەنجامدا چەندین کەس ببنە قوربانی، لەبەر ئەوەی خەڵکەکە لە ئاستێکی رۆشنبیری و هوشیاری وادایە کە ژیانی خۆیان بە گوێرەی رێسا و چەمکە زانستیەکانەوە بەرێوە دەبەن و هەڵسوکەوتێکی زانستیانە دەکەن و بەشێوەیەکی هونەریانەش شێوازی رەفتارکردنەکەیان دادەرێژن.

بەڵام لە کۆمەڵگە دواکەوتوەکاندا تەنانەت لە کۆمەڵگەی کوردەواری خۆشماندا هەزاران نمونەمان بینیوە یا بیستوە لەسەر ئەوەی کە بەهۆی ڕووداوێکی زۆر بچوك و کەمبایەخی پڕوپوچەوە کارەساتی گەلێ گەورە گەورەیان لێ کەوتۆتەوە. هۆیەکەی ئەوەیە کە میللەتەکەی ئێمە نازانێ لەگەڵ ئەم ژیانەدا بەشێوەیەکی زانستیانە و هونەریانە هەڵسوکەوت بکات و لە ژیان بەهرەمەند بێت.

## ٦- شادی و خەمۆکی:

لە کۆمەڵگەی پێشکەوتودا پێکەنین و زەردەخەنە بەسەر ژیانی خەڵکەکە زاڵە و خەمۆکی بون و دڵتەنگی و رەشبینی حاڵەتی کەم و هەڵاوێردراون. خۆشی و بەختەوەری و دڵفرەوانی بەربڵاوە، خەڵکەکە لە حاڵەتی بزێوی و زیندەکاری و کرانەوەییدان و جولەوزەیان لە ژیاندا زۆر و فرەیە.

بەڵام لە کۆمەڵگەی دواکەوتودا کە بێبەشن لە زانست و هونەری رەفتارکردن لەگـەڵ ژیان و خەڵك و واقیعدا، پێکەنین و زەردەخەنـە و دڵخۆشـی و کەیفسـازی و دڵفرەوانـی کۆچیان کردوە و خەمۆکی و دڵتەنگی و ناموورتاحی ئێش و ئازارە دەرونیەکان جێگـەیان گرتونەتەوە. چەند ساڵێك لەمەوبەر کەسێکی رۆشنبیر و زیرەك و دنیادیتە کە سـاڵانێکە ئاوارەی هەندەران بوە بەسەفەر گەڕایەوە کوردستان، من لێم پرسـی: چ شـتێك سـەرنجی راکێشای و هەسـتت بـەچی کـرد لـەناو کۆمەڵگەکـەماندا؟ گوتـی: خـەڵك پێناکـەنن. بەڕاستی خاڵێکی زۆر گرنگ و گەورەی سلبی ئەم کۆمەڵگەیەی دەستنیشان کرد. راست دەکا کۆمەڵگەی ئێمە فێرنەبوە پێبکەنێ، فێرنەبوە پێکەنین بێنێتە ئاراوە، فێرنەبوە چێژ وەرگرێ و چێژ دروست بکات.. چونکە فێری ئەم زانست و هونەرە نەبوە تا لە ژیانەکەیدا پراکتیزەیان بکات.

### ٧- هەندەسەی ژیان:

لە کۆمەڵگەی پێشکەوتودا ژیان گەیشتۆتە ئاستێکی هەندەسی، (هەندەسەی ژیـان) ژیان بۆ خەڵکەکە فەراهەم دێنێ. ژیان ئەوکاتە دەگاتە رادەیەکی خـوازراو و بـاڵا لـە پێشکەوتن، کە هەندەسەیەك بەڕێوەی ببات و دایڕێژێ. هەرکاتێك ئـەم هەندەسـەیە لـە ژیـاندا نـەما ئیـتر هەڵـەکاری و هەڕەمـەکی بەسـەر کۆمەڵگـە زاڵ دەبـێ و ئەوپـەڕی بێسەروبەری بەخۆیەوە دەبینێ. مەبەستم لە هەندەسەی ژیان ماتماتیك نیە بەڵکو ئـەوەم پێ مەبەستە کە رەوتی ژیانی بە شێوەیەکی رێکوپێك و ناهەرەمـەکی بـەڕێوە بچێـت و گشت مەسەلە و شتەکان و هەمو هۆکار و ئەنجامەکان قەدر و ئەندازەی خۆیان وەرگرن و گشت کۆششەکان لە شوێنی خۆیان بەکاربهێنرێن و ئەنجامی خـوازراو وەدەسـت بێنـن و ببنە مایەی گەشە و تۆکمە کردن و هەڵنانی تەواوی ژیانەکە.

بەڵام لە کۆمەڵگەی دواکەوتودا ژیان هەر لە قۆناغی هەڕەمەکی و بێسەروبەری دایە کە هەڵبەت ئەمەش دەبێتە هۆی بەفیڕۆدان و پەرش و بڵاوێتی ژیان و دورکەوتنـەوە لـە واتا راستەقینەکانی ژیان، ئـەو ئەنجامانـەش کـە وەدی دێـن ئـەندازە و بـڕ و شـوێن و کاریگەر و ئیجابیەتیان دیار نیە و ناخرێنە بەر کۆنترۆڵەوە.

## ٨- ژیان له کۆمەڵێك یەکە پێك دێت:

ژیانیش وەکو هەر پێکهاتەیەکی تر له کۆمەڵێك پێکنەر پێکدێن. یا بەواتایەکی تر ئەگەر بڵێین ژیان قەوارەیەکە ئەوا ئەم قەوارەیە له چەندین یەکەی بچوك و قەبارە جیاواز پێکدێت، که تەواوی یەکەکان بەهۆی شێرازە و میکانزمێکەوە بەیەکەوە گرێ دەدرێن یان یەك دەگرن و سەرەنجام قەوارەی ژیانی لێ پێك دێت. جا چونکە کۆمەڵگەی پێشکەوتو به هەرەمەکی ملی نەناوەتە نێو ژیانەوە، بەڵکو بەپێی ئەم تێگەیشتنەوە هەڵساوە یەکەکانی ژیانی دۆزیوەتەوە و یەك یەك تێیانڕوانیون و توێژینەوەیان لەسەر ئەنجام داون و تاوتوێیان کردون تا گەیشتونەتە ئەو رادەیەی بگەن به هەقیقەتی یەکەکان و رێوشوێنیان بۆ دابنێن و بیانگەیەننە ئاستی خوازراو و هەموشیان بەشێرازە و میکانزمێکی زانستیانە بەیەکتریەوە بەستۆتەوە و هونەرێکی باڵادەستیان تێدا بەکارهێناوە، بۆیە توانیویەتی باشترین ژیان وەدی بێنێ.

بەڵام له کۆمەڵگەی دواکەوتودا ژیان بەتێکەڵ و پێکەڵی و ناکامی و پێنەگەیشتویی پێکهاتوە و پێکدێت. ئەگەر شیتەلکاریەك بۆ (یەکە)کانی ژیانی کۆمەڵگەیەکی دواکەوتو بکرێت، ئەوا یان چەندین یەکەی گرنگ و بنچینەیی ژیان هەن هەر وجودیان نیە. یان ئەگەر وجودیشیان هەبێ بەئاستی خوازراو و پێگەیشتن نەگەیشتون و هەزاران کەم و کورتیان هەڵگرتوە، هەروەها ئەو میکانیزم و شێرازەیەی یەکەکانی بەیەکەوە بەستۆتەوە هیچ بنەمایەکی زانستیانەی تێدا رەچاونەکراوە، بەڵکو یا هەر بەشەپۆلێکی رەمەکیانەوە هاتونەتە دی و هیچ رێکخەر و تەوژمێکی پێشکەوتنخوازانەی نەبوە، یا ئەگەر رێکخەر و تەوژمیشی هەبوبێ زاد و بەرهەمی عەقلیەتێکی پاشکەوتوی بەجێماوی سەقەت و خۆسەپێن و بەرژەوەندی ئامێز بوە که کارەساتەکەی گەورەتر کردوە و گرفتەکانی زۆرتر کردوە و هەرەمەکیەکەی وەجۆشتر هێناوە!.

## ٩- ستاتیکا و ئەنتی ستاتیکا:

کۆمەڵگەی پێشکەوتو خاوەنی ستاتیکایە و ستاتیکا لە تەواوی ژیانیدا بەرجەستەیە. ستاتیکا پێکنەرێکی بنچینەییە له سەرجەم بوار و لایەن و پێکهاتەکانی

ژیانیدا. ئەم جۆرە کۆمەڵگەیەی کە ستاتیکای ناسیوە و هونەر و زانستی ستاتیکای دۆزیوەتەوە دەتوانێ جوانی بێنێتە دی و داهێنانی تێدا بکات.. جوانی لە هەمو شتەکاندا، لە بەرهەمەکاندا کە ئەوپەڕی دڵڕفێنی تێدا تێکەڵ دەکەن. لە کەرەستە بێگیانە مردوەکاندا کە جوانیەکی زیندو دێننە ئاراوە و واتای جوان و جوانیی زۆر جوانیان لێ پێك دێنن. چونکە لە نهێنی جوانناسیدا گەیشتون و زانست و هونەرەکەیان دۆزیوەتەوە. لەم جۆرە کۆمەڵگەیەدا گەشی و شادی و کراوەیی و جوانبەخشی بوەتە سیمای بەرچاو، رەنگ نەکوژراوە و ستەمی لێنەکراوە و گشت رەنگەکان کە هەریەکەی جۆرە شەپۆڵ و ریتم و رەزمێکی ستاتیکیایی پەخش دەکات و بەیەکەوەش پەلکە زێڕینە پێشکەش بە سەرلەبەری ژیان دەکەن؛ لە پێکهاتنی ژیاندا بەشدارن. لەم جۆرە کۆمەڵگەیەدا لە دایکبونەکان بە "جوانی" دێننە دی، ئاوەدانکردنەوەی وڵات و بەرفرەوانبونی شار و دێهاتەکان جوانی دروست دەکەن چونکە جوانی دروستیان دەکات. بێگومان تاکەکانی نێو کۆمەڵگەیەکی ئاوا چێژوەرتر و بەختەوەرترن و پتر دڵخۆش و ئاسودەترن وەك لە کۆمەڵگەیەکی بێ ستاتیکا چونکە ستاتیکا سەرچاوەیەکە بۆ بەخشینی چێژ و ئاسودەیی، مرۆڤ ئەگەر هەمیشە دیمەنی جوان ببینێ و وتەی جوان ببیستێ و بە هەڵوێستی جوان ئاشنا بکرێ یان ئەگەر لەنێو ستاتیکایەکی هەمەلایەنەدا بژیێت ئەوا ئەم ستاتیکا و جوانیانە بەرەبەرە خۆشی و چێژ و جوانی و گەشاوەیی دەخەنە کانگای دەرون و یادگەی مرۆڤەکەوە، کە سەرەنجام دەبنە بنیاتنەری کەسایەتیەکی گەشبین و ئاسودە و فێری دەکەن کە جوانیەکان هەست پێ بکات و لایەنە روناك و گەشاوەکانی ژیان ببینێ و زاڵ بێ بەسەر لایەنە کرچ و کاڵ و بودەڵە دەرونیەکان کە مایەی پەشۆکاوی و خەمباری و ماتومەلولین.

بۆ نمونە کە سەیری تابلۆیەکی خۆشنوسی حامد ئامیدی دەکەیت یان کە گوێ دەگریە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بەدەنگی عبدالباسط یان مەنشاوی، چ تاموچێژێك وەردەگری؟!.. هەست بەچ جوانیەك دەکەی؟! ئایا ئەم تاموچێژ و جوانیانەی کە پێتدەبەخشن نابنە مایەی ئارامی دەرون و ئاسودەبونت؟ نابنە هۆیەك بۆ ئەوەی تۆ بە دیوە روناکەکەی ژیان لە ژیان بڕوانی؟.

کۆمەڵگەی پێشکەوتو لە هەمو روێکەوە ستاتیکای جۆرا و جۆر دادەهێنێ؛ ستاتیکای رۆحی، ستاتیکای جەستەیی، ستاتیکای عەقلی، ستاتیکای دەرونی، ستاتیکای عاتیفی، ستاتیکای هونەری، ستاتیکای ئەدەبی، ستاتیکای شارستانی، ستاتیکای تەکنەلۆجی، تەنانەت ستاتیکای تراژیدیش.. کە هەڵبەت لە هەمو ئەم لایەنانەدا شاکاری ستاتیکای مرۆڤانەیی بەنێوبانگی وا لە جیهاندا هەن کە هەمو جۆرە کەسێك دەتوانێ لێیان بەهرەمەند بێ.

بەڵام لە کۆمەڵگەی دواکەوتودا ستاتیکا وجودی نیە ئەگەر هەشبێ ناکام و ناتەواوە. کەچی ئەنتی ستاتیکاکان ئەوەندە زۆرن کە لە ژمارە نەیەن، ژیان لەوێدا هەر لە بنەڕەتەوە بەبێ ستاتیکا هاتوەتە پێکهاتن و گەشەکردن، بۆیە مرۆڤەکان لەنێویدا نامورتاحن، ماندون، بارقورسن، سەخت و رەقن، چێژ مردون، هەست ناسك و جوانناس نین، پتر دیوی تاریك تاریك و سلبی دەبینن هەر بۆ نمونە ئەگەر گوێ بگریە باسوخواس و سوالفە و وتووێژی کۆمەڵگەکەی خۆمان بۆت دەردەکەوێ کە چەند پڕن لە شتی خەماوی و دڵساردکەر و بێزارکەر و بەدەگمەن نەبێ چێژ و ناسکیان تێدا وەدی ناکەی!

لەم جۆرە کۆمەڵگەیەدا تەنانەت ئەگەر سەیری جۆر و رەنگی جلوبەرگ و دار و دیوار و خانو و نێوماڵیش بکەی هەر بەڵگەن لەسەر دەرونی مات و نەخۆش و خەمۆك و مردۆخ چونکە رەنگەکان یا بۆر و بێزەوەرن یا رەش و تڵخن.. بەکورتی رەنگی مردە و بێ وزەن. سەیرە! لەنێو ئەو هەمو رەنگە جوان و رەنگاورەنگانەی خوا خەڵقی کردوە کام رەنگی مردی و بێوەجە بەنیشانەی پیاوەتی و شەرم و شکۆیی هەڵبژێردراوە!.

خوای گەورە خۆی جوانە و هەر ئەویش جوانی وەدیهێناوە، جوانی خوای گەورە لە سەرتاپای بونەوەر درەوشاوەتەوە، لە ئاسمانی شین و ساماڵ، لە ئەستێرە بریسکەدارەکان لە دار و روبار و دەریا و مرۆڤ و دیاردە و وەرزەکان و تاد.. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (( إِنَّ اللهَ جَمِيلٌ يُحِبّ الجَمال: خوا جوانە و جوانیشی خۆش دەوێت)). کەواتە هەر کۆمەڵگەیەك هەماهەنگ نەبێ لەگەڵ ئەو ستاتیکانەی کە خوا لە گەردون و بونەوەری سازاندوە، بێگومان لات و پوت و بێبەش دەبێ لەو بەهرە جوانانەی کە خوا بۆ مرۆڤی فەراهەم هێناوە.

❊ ❊ ❊

پێویسته نوسەرانی ئیسلامی توێژینەوەیان لەبارەی ئەم جۆرە زانست و هونەرانەوە زۆربێت و شتی زۆری لەبارەوە بنوسن. تاکو موسڵمانان لە ئاسەوار و بەهرەکانی ئەم زانست و هونەرانەوە بێبەش نەبن و بتوانن ژیان و گوزەران و هەڵوێست و رەفتار و وتەکانیان رێکخەنەوە و لە بەڕێوەبردن و چۆنیەتی پراکتیزەکردنی ژیاندا باڵا دەست بن و بگەنە ئاستێکی بەرز لە هۆشیاری تا ئەو رادەیەی گشت رێبیر و فام و یاسا و رێسا و رێوشوێنە گرنکەکانی هونەر و زانستی ژیانیان لەنێودا بەرقەرار دەبێ و چیتر کات و کۆششیان بەفیڕۆ ناڕوات و لەو شڕە ژیانە رزگار دەبن.

من کە ئەم کتێبەم دی بەڕاستی زۆرم کەیف پێ هات و دڵخۆش بوم کە دکتۆر و زانایەکی ئیسلامی تاووتوێی بابەتانێکی ئاوەهای کردوە، بۆیە بڕیارم دا وەریگێڕمە سەر زمانی کوردی چونکە هەست دەکەم کە خەڵکەکەی ئێمە چەند پێویستی بەم جۆرە زانست و هونەرانە هەیە و چەند دەستکورتن لەم بوارەدا.

خوا سەرکەوتومان بکات بۆ کاری خێر و چاکە و بەرەکەت بخاتە کارەکانمان و دڵسۆزیمان پێ ببەخشێ.

سالار محمد قادر

٢٠٠٣/٦/٢٩

# بەناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

ستایش بۆ پەروەردگاری بونەوەر، درود و سلاو لەسەر پێغەمبەری سەروەری گشت پەیامبەران، سلاو و میهرەبانی خواش لە تۆ خوێنەری بەڕێز.

لەلای تۆش ئاشکرایە، کە خوا پەیمانی لە بەندەکانی وەرگرتوە، کە هەر ئەو بە تەنها بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار نەدەن و ژیانیش بکەن بە میحرابی یادی خوا و تەوحید و پابەندبون بە شەرعەکەی.

جا یەکێك لە بڕگەکانی ئەم پابەندبونە بریتیە لە ئامۆژگاریکردنی موسڵمانان و هاریکاریکردنیان لەسەر چاکە و لە خواترسی و ڕونکردنەوەی ڕێی هیدایەت بۆ خەڵکی و چاکە فێرکردنیان. بێگومان پیشەی پێغەمبەرانیش -سلاوی خوایان لێبێ- هەر ئەمانە بون.

لە ماوەی گەشتی سنورداری ژیاندا، گرفتێکی گەورە سەرنجی ڕاکێشام، کە ژیانی هەمو کەسێکی داگیرکردوە.

گرفتەکەش ئەوەیە کە: زۆر لەو هێز و توانست و تواناییانەی خوا بە مرۆڤی بەخشیوە لەکارخراون، کە وا لە مرۆڤ دەکەن کۆڵ و کلۆڵ بێ وەك خوا لە قورئاندا وەسفی دەکات کە کۆڵ و کلۆڵ ڕو لە هەرکوێ دەکات چاکە وەدەست ناهێنێ.

یاخود مرۆڤ بە خراپی ئەم هێز و تواناییانەی بەکاردێنێ، بۆیە کار و کاریگەریەکەی لە ژیاندا کەم دەبێتەوە و گرفتەکانی زۆر دەبن و بەرهەم و بەخشینەکانی کەم دەبنەوە و خەریك دەبێ داهێنانەکانی لە ژیاندا نەمێنێت، هەروەها دەبێتە یەخسیری ستایلێکی[1] بکوژانەی گشت جۆرە بەخشین و پێشکەوتنێك و، بەدەوری شتە بچوکەکانی ژیان دەخولێتەوە و خۆی دەتوێنێتەوە و لە دێراوەکانیدا دەخنکێ و، باریکە ڕێی ورد وردی بۆ ساز دەکەن و خۆی بە داخ و خەفەتی شتە بێنرخەکان دەفەوتێنێ و، هەمیشە بە خەم و پەژارەکانی ستایلێکی بکوژانەوە دەتلێتەوە.

---

١ ستایل: جۆر، ڕێگە.

هۆی هەمو ئەمانە ئەوەیە، کە مرۆڤ ئەو بەهرانەی لەکارخستوە کە خوا پێی بەخشیوە، یان رێنوێن نەبوە بە چاکترین شێوە بەکاریان بێنێ. جا ئەگەر تاکەکانی کۆمەڵگە ئاوەهایان لێبێ کە باسمان کرد، ئەوا ئوممەتیش دەبێتە کۆمەڵێکی پڕ لە دەسبەتاڵ و نەخۆشان، یان لە باشترین حاڵەتدا دەبێتە کۆمەڵێکی لاساکەرەوە، کە ژیان لە پەلوپۆیان دەخات و تواناکانیان سەرف دەبێ بێ ئەوەی شتێکی نوێ بخەنە ژیانەوە، یا سەری کەسێکی پێ بەرز بکەنەوە. ئەو کاتە ئوممەت ئەو رۆڵ و رێبەرێتی و سەروەرێتیە لەدەست دەدات، کە پەیامی خوا پێی سپاردوە. ئیتر نەتەوەی تری سەر زەمین دەبنە پێشەنگ، خەڵکیش کەسانی نەزان دەکەنە سەرۆك، کە هەم خۆیان و هەم خەڵکیش بە گومرا دەبەن.

ئائەمەیە ناسۆری مرۆڤایەتی.. کە موسڵمان بەدرێژایی تێپەڕبونی سەدەکانەوە هێدی هێدی، بوە مرۆڤێکی ئاسایی و ئامادەیی نەما خۆی و خەڵکی بەرەو پێشەوە بەرێت، بۆیە ئوممەتیش لە تەنیشت رێگاوە ژیان بەسەر دەبات و لە رێبواران دەڕوانێ و خۆی ناکەوێتە رێ. کەچی هەر خۆی بو کە پێشتر لە پێشی پێشەوەی کاروان بو.

لەبەر ئەم هۆیە پۆلێکی تری مرۆڤایەتی کە رۆژئاواییەکانن، چونە ریزی پێشەوە و، ئێستا ئەوان مرۆڤایەتی رادەپێچن. کە ئەوان ئوممەتێکی نەفامن لەمەڕ پیشە و رۆڵی پێ سپێردراوی مرۆڤ لە ژیاندا، نەفامن لە ئاست هەقیقەتی گەردون و پەیوەندیەکان و سەرەتا و کۆتایی و مەبەستی وەدیهاتنەکەی.

نەفامن لەمەڕ جیهانی نادیار و پێکنەرەکانی. بۆیە ئەم ئوممەتە لایەنێکی مرۆڤ رێبەری دەکات، لەسەر حیسابی لایەنێکی تری و بەیەك چاو لە مرۆڤایەتی دەڕوانێ، بۆیە هەم خۆیان و هەم خەڵکیشیان بە گومڕابردوە هەروەکو پێغەمبەرمان ﷺ هەواڵی پێداوین.

راستترین ناو هەر وەکو پێغەمبەر ﷺ هەواڵی پێداوین- ناوی (جوتیار: حارث) و (همّام: مشورخۆر)ن، چونکە مرۆڤ خاوەنی توانست و ئیرادەیەکی ئەوتۆیە، کە دەتوانێ ژیان ئاوەدان بکاتەوە و دادگەری و یەکسانی لەسەر زەویدا بەرپا بکات، هەم خۆی و هەم خەڵکیشی پێ بەختەوەر بکات.

بەڵام ئەگەر ئەم توانا و ئیرادەیەی لەکارخست، ئەوا کۆڵ و کلۆڵ دەبێ، خۆ ئەگەر بە کەمتەرخەمیەوە سودی لێ وەرگرتن ئەوا ناسوپاسگوزاری کردوە، بەڵام ئەگەر بە خراپ

بەكاريان بێنێ، ئەوا هەر تەنها بەدكاری و وێرانی لە زەمیندا بلاو دەكاتەوە.

ئەگەر وردبیتەوە، دەبینی گەلێ كەس سكالای حالی پەشۆكاوی خۆیان دەردەبڕن و بە گرفتەكانی ژیانەوە گرفتارن. بەلام ئەمانە ئەگەر كەمێك بیر لە چارەی حالی خۆیان بكەنەوە، دەبینن چارەسەریەكە لەوان نزیكە و كلیلەكەش لە ناخی خۆیان دایە.

خوێنەری بەرێز: لە میانەی رامان لە ژیان و تێكەلبون لەگەل خەلكی و هەولدان بۆ یارمەتیدانیان، بۆ چارەسەركردنی گرفتەكانیان و هاوخەم بونم لە كۆسپ و تەگەرەكانی ژیانیان و خوێندنەوەی هەندێ لە نوسراوەكانی ئەو بوارەوە و تۆماركردنی هەندێ لە هەست و نەستەكانم و لە كاتی جۆراوجۆردا، ئەم وشانەی لەم كتێبەدا نوسراون هاتونەتە بەرهەم، كە بەهومێدم یاریكار بێ لە چارەسەركردنی هەر گرفتێك و لابردنی هەر تەگەرەیەكی سەر رێگە و، ببێتە مایەی زیادبونی كارلێك و، جموجۆل خستنی لەكاركەوتوان و وشیاربونەوەی نوستوان.

ئەم هزرانە[1] بریتین لەو سود و بەهرانەی، كە لە ئەنجامی خوێندنەوە و ئەزمونە واقیعیەكانی ژیانەوە وەرگیراون، هەولم داوە -بەپێی توانا- هەر هەمویان لەبەر رۆشنایی سروشەوە رابنوێنم، تاوەكو ناراست و نارەواكانی لێ داوەشێنم و، رەوا و راستەكانیشی تێدا بهێلمەوە، یا لەبەر رۆشنایی عەقلی بێگومان لە تەرازویان بدەم و لەگەل ئەمانەشدا رەچاوی سوننەتەكانی خوام كردوە، كە ژیان و بونەوەری پێ هەلدەسورێ.

ئەم هزرانەی نوسراونەتەوە لەگەل ئەوەی كورتیشن، بەلام مرۆڤی خاوەن هزر و رێبیر و هەلگری پەیام و خاوەن دۆز[2] دەتوانێ لێیان بەهرەمەند بێت.

هەروەها فەرمانبەری سەرۆك و ناسەرۆكیش دەتوانن سودی لێ وەرگرن.

تەنانەت تاكەكانی خێزانیش: ژن و مێرد و باوك و كوڕیش دەتوانن سودی لێ وەرگرن.

ئەوانەی خاوەن كار و پارەدار و وتوێژكار و گفتوگۆكار و پلان دارێژیشن و ئەوانەش كە لە دلساردی و بێهومێدی دەترسن، یان توشی خۆ بەگەورە زانین و لوت بەرزی وشتی تر بون، دەتوانن سودی لێ ببینن.

---

١ هزر: فكر، بیر.

٢ رێبیر: مبدأ      دۆز: كێشە

بەڵام بەو مەرجەی هزرەکان بکرێنە کردەوە و هێدی هێدی پراکتیزە[1] بکرێن و، هەر هزرە و لە شوێنی خۆی بەکار بهێنرێ و نەخۆشیەکان بە راستەقینەیی چارەسەر بکرێن .
((سەرکەوتنیش هەر بریتیە لە هێز و هەق و ورە بەرزی و خۆڕاگری، هەرەس(فشل)یـــش بریتیە لە نارەوا و دەستەوسانی و ورە بەزیوی و ڕاشێواوی)).

ئەم کتێبەم بەسەر سێ بەش دابەشاندوە:

١- چەند هەڵوەستەیەك بۆ خۆ پەرەپێدان و زیادکردنی جموجۆڵ و چالاکیی.

٢- تۆ و کەسانی تر: بەرەو پەیوەندی باشتر و پەیوەندی پێکردنی تەواو تر.

٣- ئایا دەتەوێ لە کارەکەتدا سەرکەوتو بیت؟

لە کۆتایی ئەم پێشەکیی و رونکردنەوەیەدا، لە خوای میهرەبان و بەبەزەیی دەخوازم، کە هەر بۆ کاری خێر بمانسازێنێ و یارمەتیمان بدا، تا رەزامەندی ئەو بەدەست بێنـــین و بمانخاتە سەر رێی هیدایەتەوە. خوا یاریکارە و هەمو کار و جوڵەیەك بەهۆی خواوەیە.

* * *

١

---

١ پراکتیزە: پیادە، تطبیق.

# بەشی یەکەم

## چەند هەڵوەستەیەک بۆ بەرەبەرە خۆداهاو
## زیادکردنی جموجۆڵ و چالاکی

## بەهای ژیان لە ئامانجەكانیەتی

خوای بەرز و بالاّ دەست ژیانی بەبێهودەیی و، مرۆڤیشی بە بەرهەڵدایی نەهێناوەتــە دی.. دەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا: پێتان وایە هەروا بەبێهودەیی ئێوەمان هێناوەتە دی؟!﴾المؤمنون/١١٥.

﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ: مرۆڤ و جنۆكانم بۆ ئەوە هێناوەتە دی، تا بمپەرستن﴾ الذاريات/٥٦.

مرۆڤی ژیر و تێگەیشتو بەسای ئــەو عەقڵــەی خــوا پێــی بەخشــیوە و بــەهۆی ئــەو فیترەتەی تێیدا چەسپاندویەتی پەی بەمە دەبات، كە بێگومان وەدیهێنانی ئەم گەردونــە بە شیرازەیەكی وا دانسقە و وردەكار و وەدیهێنانی ئەم مرۆڤە لە رێكوپێكترین شــێوەدا؛ دەبێ ئامانجێكی مەزن و مەبەستێكی پیرۆزی هەڵگرتبێ، كەواتــە مــرۆڤ ئەگــەر هــەر بەشە وەختێكی ژیانی خۆی بەفیڕۆ بدات، یان كە خۆی لە بازنەی بۆشدا ببینێتەوە و لــە بێهودەییدا وێڵ بێ، ئەوا هەڵبەت كارێكی پێچەوانە و دژ بەم راستیانەی ئەنجام داوە. بە پێچەوانەوە مرۆڤ دەبێ بۆ هەر بەشە كاتێكی ژیانی ئامانجێ دیاری بكات و لە تــەواوی كارەكانیشدا مەبەست دەسنیشان بكات و لەسەر ئەم بنچینەیە ژیانی خــۆی بەرنامــەرێژ بكات. خۆ ئەگەر لە رێژینی[1] ئەوانەش، كە لە ژیاندا ســەركەوتنیان وەدەســت هێنــاوە رابمێنیت ئەوا بۆت رون دەبێتەوە، كە ئەوان هەر چەندی پتر ژیانیــان بــەپێی ئامانجــەكان رەنگرێژ كردبێ زیاتر و زیاتر سەركەوتنیان تۆمار كردوە.

حەسەنی بەسرایی بە زاری عومەری كوڕی عەبدولعەزیز -خوا میهرەبانییان لەگــەڵدا بكات- دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ((نەمزانیوە عومــەری كــوڕی خــەتتاب هیــچ هــەنگاوێكی هەڵێنابێ مەبەست و نیازێكی لەگەڵدا نەبوبێ)).

سەلمانی فارس -رەزای خوای لێبێ- دەڵێ: ((من وەك چۆن واگاییم بەهەند هەڵدەگرم ئاواش خەوتنم بەهەند هەڵگرتوە و حیسابیان بۆ دەكەم)).

---

١ رێژین: رابردوی ژیان، سیرە.

ئامانجەکانیش لە ژیانی مرۆڤدا دەبنە دوو بەش:

١-ئامانجە گەورە و هەمووەکی و هەمیشەییەکان، یا وەك دەڵێن ئامانجە ستراتیژیەکان.

٢-ئامانجە بچوك و هەندەکی و قۆناغنامێزەکان، یان ئامانجە تەکتیکیەکان.

جا پێویستە ئامانجە بچوکەکان هەمیشە لە خزمەتی ئامانجە گەورەکان دابن و بە بەرژەوەندی ئەوان تەواو بن و ببنە ئامراز و رێگایەك بۆ بەدیهێنانیان.

ئاشکرایە کە گەورەترین ئامانج و مەزنترین مەبەست و پیرۆزترین حەز و نیازیش، کە مرۆڤ لە ژیانیدا بۆی تێبکۆشێت، بریتیە لە وەدەستهێنانی رەزامەندی خوای پەروەردگار بەهۆی ئەو رێگە و ئامرازانەی، کە خوا بەرنامەی بۆ داناوە وو رێی پێداوە.

لەم جێباسەدا هەوڵ دەدەم چەند هزرێك بخەمە ڕوو، کە یارمەتی مرۆڤ دەدات تا بتوانێ ئامانجەکانی لە بوارە جیاجیاکانی ژیانیدا دەسنیشان بکات، ئەم هزرانەش ئەمانەن:

١- وریابە، نەکەی دەرونەکەت وا ڕابێنی کاری بێ ئامانج بکات، چونکە دەرون وەك منداڵ وایە، لەسەر هەر شتێکی ڕابێنی ئیتر پەخەگیرت دەبێ.

ڕەنگە کەسانێك بپرسن و بڵێن: کەواتە سەرلەبەری ژیان یەکپارچە دەبێتە جددیەت و جێگای کەیفسازی و گەشت و گوزاری تێدا نابێتەوە؟.

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر هەرگیز، چونکە دەرونی مرۆڤ بەرگە ناگرێ جۆرە ژیانێکی ئاوا بگرێتە خۆ. بەڵام دەڵێم: تەنانەت با کەیفسازیەکانیش لە کاتێکی گونجاو و بەچۆنیەتیەکی گونجاوی وابن، ببنە ئامانجێکی ویستراو و رێگە پێدراو و لە چوارچێوەی ئامانجە خوازراوەکاندا بن.

بۆ نمونە: دەتەوێ لە رۆژی یەکشەمەدا گەشتێك بکەی بۆ گوندی (س)، مەبەستتە سێ ڕۆژی تێدا بەسەربەری، ئایا ئامانجەکانت لەم کارەدا چیە؟..

بۆ نمونە با ئەم ئامانجانە بن:

١-سەردانی ماڵی خوشکت دەکەیت و خۆی و ماڵ و منداڵ و مێردەکەی بەسەر دەکەیەوە و، چەند دیاریەکیشیان پێشکەش دەکەی.

٢-سەردانێکی مزگەوتی گوندێکی نزیك دەکەیت، کە داوای یارمەتیت لێکراوە لە چاکردنەوەیدا بەشدار بی.

٣-گەڕان و سوڕانێك بكە بە نێو سەیرانگەیەكی نزیك لە گوندەكە، تـا جوانیـەكانی وەك یادگاریەك لە ئەندێشەتدا بمێننەوە.

٤-لەگەڵ پیاوێكی پیری گوندەكە دابنیشی و لەبارەی ئەو ڕوداوە مێژوویانـەی خـۆی بینیویەتی، پرسیار بكەی و سود و بەهرە لە ئەزمونەكانی وەربگری.

٥-سەیر و سوڕانێك[1] بكەی و بیر لەوە بكەیەوە ئاخۆ تاچەند لە تواناتدا هەیە لەگەڵ كۆمەڵە برادەرێكی نێو گوندەكەدا پرۆژەیەكی وەبەرهەم هێن[2] لە گوندەكە دامەزرێنی.

٦-ئەگەر بگونجێ وتارێك، یان چەند ئامۆژگاریەك لە مزگەوتی گوندەكەدا پێشكەش بكەی.

بەجۆرە هەر كردەوەیەك كە بەنیاز بیت بیكەی دەبێ ئامانجێك، یان چەند ئامانجێكی پێشینەبیت بۆ دیار كردبێت، هەروەها بەگوێرەی گرنگیەكانیان ڕێكیـان بخـەی و پاشـان بەرێكوپێكی كاتیان بۆ دابەش بكەی.. جا كە كارەكەت بـەكۆتا گـەیاند سـەیر دەكـەی ئاخۆ بەچ ڕێژەیەك ئامانجەكانت وەدەست هێناوە.

ئەگەر خۆت لەسەر نەشمی[3] ئەم جۆرە ژیانە ڕاهێنا ئیتر ژیانەكـەت خۆبەخۆییانـە[4] دەبێتە ژیانێكی ڕێكوپێك و ئامانجدار و بێسەروبەری قبوڵ ناكات و فەراغ بەسـەریدا زاڵ نابێت و كاتەكان (بڵێ ژیان)یشی تێدا بەفیڕۆ ناچێت.

٢- لەكاتی دیاریكردنی ئامانجەكاندا **پێویستە بەردەست و پێشبینكراو** لەبـەر چـاو بگیرێت پاشان بە گوێرەی تواناكەوە ئامانجەكان دیاری بكرێن، بەجۆرە نەبێ كە ئامـانجی خەیاڵی بەتەما بخوازێ، لەكاتێكا توانا ئامادەكراوەكانیش یان ئەو توانایانەی كە پاشـان ئامادە دەكرێن، توانای كەم و ناكام بن. بەواتایەكی تر دەبێ ئامانجەكان لەبارياندا هەبێ وەدەست بخرێن و دابین بكرێن. بۆ نمونە ئەگەر بەنیازی دامەزراندنی پرۆژەیەكی بازرگانی بیت، پێویستە بیر لەوە بكەیتەوە كە چەند پـارە و پولـت پـێ تـەرخان دەكـرێ، پاشـان بەگوێرەی بڕی پارە و پولەكە قەبارەی پرۆژەكە دیاری بكە.

---

[1] سەیر و سوڕان: استطلاع.

[2] پرۆژەی وەبەرهەم هێن: مشروع استثماري.

[3] نەشم: نمط، ستایل.

[4] خۆبەخۆییانە: تلقائي.

یان که مەبەستتە ئیشێك بۆ خۆت بدۆزیەوە سەیری ئەوە بکە، کە چ بڕوانامەیــەکی خوێندن و چ جۆرە ئەزمونێکی پراکتیکیت هەیە، پاشان لەبەر ڕۆشنایی ئەمــەدا جـۆر و پلە و ئاستی ئیشەکە دیاری بکە کە هەوڵی بۆ دەدەی.

لەبەرامبەر ئەمەدا پێویستە لەمەش وریابی، کە داهات و توانا بەردەســتەکانت لـە پێناو چەند ئامانجێکی زۆر و نزم و بچوکدا تەرخان نەکەی، لە کاتێکدا توانات هەبێ بۆ ئامانجی گەورەتر هەوڵ بدەی. هەردووکیان -خـۆ هەڵواسـین بـە ئامانجـە خەیاڵیـەکان و خەریکبون بە ئامانجە نزم و بچوکەکان- کار بە فیڕۆ دەدەن و وزەکان بەهەدەر دەبەن.

٣- پێویستە ئەو ئامانجەی کە هەوڵی بۆ دەدەی وەدەستی بێنــی هـاوڕێژە و گونجـاو بێ، لەگەڵ ئەو بڕە کاتەی بۆت مەزندە کردوە. چونکە یەکێك لــە ترسـناکترین کـوژەری ئامانجە چاکەکان، نەبونی کاتی تەواو و پڕ بە پێستە بۆ وەدەست هێنانیان.

بۆ نمونە وەك ئەو کەسەی کە دەیەوێ دوای تەواوکردنی قۆناغی ئامادەیی، بڕوانامەی زانکۆی پزیشکی بەساڵێك وەدەست بێنێ!.

ئەمەش هەمان شتە کە ئەگەر یەکێك کاتێکی زۆر درێژ و فـرەوان لـە پێنـاو چـەند ئامانجێکی وا بەفیڕۆ بدات، کـە دەکـرێ بـەکاتی کـەمتر وەدەسـت بـهێنرێن. وەك ئـەو کەسەی کە دەتوانێ بەماوەی چوار سـاڵان زانکۆ ببڕێ، بەڵام هــەر دوورودرێـژ بکاتـەوە و خۆی وەدوا بخات، تا لە ئەنجامدا لە ماوەی هەشت ساڵدا ئامانجەکەی وەدی دێنێ!.

هەستکردن بە بەها و گرنگی کــات، سـەرەتایەکە بـۆ وەجموجـۆڵ خسـتنی دەرون و خرۆشاندنی هۆش و پەرۆشی مرۆڤ، وای لێدەکات پەی بە (رابردە) ببات و (ئێستا) بــە دەرفەت بزانێ و بۆ (داهاتو)ش ئامادەیی وەگرێ. هیچ زیانێك لە زیانی کــات گـەورەتر نیە، زیانێکی ئەوتۆیە، کە هەرگیز قەرەبو ناکرێتەوە. کات لە دیدی ژیر و هۆشمەندانەوە بەهایەکی گەورەی هەیە، کە بەهای پارە و پول لە ئاست ئەو بەها بەرزەدا گەلێ بودەڵــە و پوکەڵەیە.

٤- پێویستە ئەو ئامانجەی کە هــەوڵی وەدەســتهێنانی دەدەی ئامــانجێکی ڕێپێـدراو بێ. ئاشکرایە ئەو ئامانجانەی کە لە توانا بەدەر نین گەلێ زۆرن و دەرگاکانی ژیان تەنــها لە ڕووی دەستەوسانان داخراون، ئەگینا پێغەمبەر یونس -علیه السلام- لــەناو هــەناوی نەهەنگیشدا بێکار نەبو و تەسبیحاتی خوای دەکرد.

هەندێ ئامـانج هـەن رێپێـدراون و هـەندێکیش پـێ نـەدراو، مـرۆڤ نابـێ هـەوڵی وەدەستهێنانی رێپێنەدراوەکان بدات یان تەنانەت بیریشیان لێ بکاتەوە. جا هەر کـرد و کۆشێك ئەگەر لەپێناو بەدکاریدا بێ، یان بەدکاری لێ بکەوێتەوە ئەگەرچی ئامـانجێکی بەردەستیش بێ، یان چێژ و سودێکی دەسبەجێش بە بکەرەکە بگەیەنێ، ئەوا بـەپێودانی رێنوێنی ئاینی ئیسلام ناقبوڵ و رەتکراوەیە، هەروەکو خوا دەفەرموێ:

﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُـورًا: هـەرکارێکی کردویانـە ڕای دەنێین و وەکو تۆزی بابردەڵەی پێدەکەین.﴾ فرقان/٢٣.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((مَنْ عمل عملا ليس عليه أمرنا فهو رد: هەرکەسێك کارێك بەپێی رێوشوێنی ئێمە نەکات لێی قبوڵ ناکرێ و رەت دەکرێتەوە)).

تەنها کەسانێك دەتوانن کاری رێپێدراو بە ئامانج بگـرن و خـۆ لـە رێپێنـەدراوەکان وەدور بگرن کە لەبەر سێبەری بڕوا و روناکی سروشدا ژیان بەسـەر دەبـەن و، لـە پێنـاو پاداشتی ڕۆژی دوایـیدا هەوڵەکانیان بۆ ئاوەدانکردنەوەی زەوی تەرخان دەکەن. بەڵام ئـەو دڵانەی بە ڕوناکی پەیامەکەی موحەممەد ﷺ ڕوناك نەبۆتـەوە، بێگومـان دڵـی تـاریك و فەوتان و -پەنا بەخوا- هەر بۆ بڵاوکردنەوەی بەدایەتی ورتە ورتیانە ئەگەرچی پێشـمان وابێ کاری چاك دەکەن!.

هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی پارە و پول و فرەکردنی سـامان و چێـژ وەرگرتـن لـە شـتە خۆشەکانی ژیان و بەخشین لە پێناو کاری چاکدا، ئامانجێکی جوانی ئەوتۆیە کـە هـەمو هەوڵدەرێك دەتوانێ بۆ خۆی دیاری بکات، بەڵام هەر هەمان ئامانج دەکرێ لـە رێگـای چەند پرۆژەیەکی بازرگانی و کشتوکاڵی و پیشەسازییەوە بێت و، دەشـکرێ لـە ڕێگـای فڕوفێڵ و بەرتیل و خەڵەتاندن و سوو[1] و سڕکەرەکانەوە[2] بێت.

هەموو هەر بریتین لە کۆکردنەوەی سامان و وەدەستخستنی پارە و پول، بەڵام گوڵزار و گوفەك(ثریا) قەت وەك یەك نین. یەکەمیان بەحەڵاڵی پارە و پولەکەی کۆکردۆتەوە، کە هەم لە دنیادا بۆی دەبێتە بەختەوەری و، هەم لە دوایشـیدا بـە هۆیـەوە ڕزگـاری دەبـێ ئەگەر بەچاکی خەرجی بکات، ئەوەی تریش پارە و پولەکەی بە حـەڕامی کۆکردۆتـەوە،

---

١ سوو: ريبا.

٢ سڕکەر: موخەددەرات.

که هەم لە دنیادا بۆی دەبێتە بەدبەختی و، هەم لە دوایيشدا بـۆی دەبێتـە ئەشـکەنجە و دۆزەخ.

نمونەیەکی تر، یەکێك دوای ئەوەی پشت بەخوا دەبەستێ و لێی دەپارێتەوە و پـەنای وەبەر دەبات، دەیەوێ بەهۆی خوێندن و خۆماندوکردن و نەسرەوتن و متمانـە لەسـەرخۆ کردنەوە لە خوێندنەکەیدا سەرکەوێ، لە بەرامبەر ئەوەدا یـەکێکی تـر دەیـەوێ بـەهۆی فرو فێڵ و قۆپیە کردن و متمانە کردن لەسەر هاورێکانیەوە سـەرکەوێت.. ئـاخر ئـەم دو وێنەیە وەك جیاوازی نێوان ئاسمان و رێسمان وایە.

٥- پێویستە ئامانجەکە رون و دیـاریکراو بێـت، لێڵـی و تێکـەڵی و پێکـەڵی تێـدا نـەبێت. چونکـە دیارنـەکردن، یـان روون نـەبونی ئامـانج وا لـە مـرۆڤ دەکـات بـــە مەبەستەکانی نەگات، یان نەزانێ چی دەوێت. بۆ نمونە یەکێك ئەگەر مەبەستی بێت لـە زانکۆ بخوێنێ، بەڵام دیاری نەکات کام تایبەتمەندی و کام زانکۆ و کام وەخت هـەڵبژێرێ؛ هەڵبەت ئامانجەکەی دیاری نەکردووە و زەحمەتیشە پێی بگات.

یـا وەك ئـەو کەسـەی کـە دەیـەوێ کـارێکی تـر بدۆزێتـەوە، بۆیـە واز لـە فەرمانبەرایەتیەکەی دێنێ و هیچـی تـر، یـان کـە دەیـەوێ گەشـتێ بکـات بێئـەوەی ئاراستەی گەشتەکەی یان سروشـتی ئـەو کارانـە دیـاری بکـات کـە مەبەسـتیەتی لـە گەشتەکەیدا وەدەستیان بێنێ.

کەواتە دەبێ ئامانجەکە رون و ئاشکرا بێ و بەوردی دیاری بکرێت، تا بەڵکو لەگـەڵ ئامانجی تر تێکەڵ و پێکەڵ نەبن و، بتوانرێ هەوڵی بۆ بدرێ و وەدەست بهێنرێت.

یەکێك لە رونییەکانی ئامانج ئەوەیە، کە ئامانجەکە ئیجابی بـێ نـەك سـلبی. واتـا ئەوەی کە دەتەوێ دەبێ بە رون و ئاشکرایی دیاری بکەی. یەکێك لەو هەڵانەی کـە زۆر لە خەڵکان تێیدەکەون ئەوەیە، کاتـێ کـە پرسـیاریان لێدەکـرێ چ ئامانجێکیـان بـەنیاز گرتوە: ئەو شتانەت بۆ باس دەکا کە مەبەستی نین، چونکە ئەو شتانەی کە مەبەستیەتی لەناو مێشکیدا رون نیە بەڵکو هەر بیریشی لێ نەکردونەتەوە.

روونیەکی تری ئامانج ئەوەیە کە زۆرترین وردەکاریەکانیت لەبەرچاو بێ وەك بڵێی وا هاتبنە دی و هەمویان لەبەر دەستتدا بن.

٦- یەکێك لە مەرجەکانی وەدیهێنانی ئامانجەکان بریتییە لە دارشتنی پلانێکی پراکتیکانە[1] بۆ گەیشتن پێیان. ئامانج هەر چەندی مەزن و بەرتوان و رێپێدراو و دیاریکراو بێ، مادەم رێگەی گەیشتنەجێیان رون و ئاشکرا نەبێ، ئەوا هەر تەنها وەکو هزر و هومێد دەمێنێتەوە و نایەنەدی، بەلام ئەگەر بمانەوێ لە واقیعدا بیهێنینە دی، ئەوا دەبێ پلانێکی وای بۆ داریژین بمانگەیەنێتە مەبەست.

ئا ئەمەیە دوریانی نێوان مرۆڤە جددیەکان و مرۆڤە فشەکارەکان لە ژیاندا. ئەو کەسانەی رشت و جددین هەرکە ئامانجیان دیاریکرد یەکسەر بیردەکەنەوە و خۆ ئامادە دەکەن، کە چۆن وەدەستی بێنن و پێی بگەن. هەروەها لەوە دەکۆڵنەوە کە چەند لێی دورن یان نزیکن و ئەو بەربەستانە چین کە لە رێگاکەدا هەن، یان پێشبینی دەکرێن بێنە سەر رێگا و چۆن دەتوانرێ تەخت بکرێن و لە کۆڵ بکرێنەوە.

بەلام تەمبەڵ و پاشانبێژەکان[2] هەر وا راهاتون چەندین ئامانجی خەیاڵی لەبەر نیاز بگرن، کەچی تەنها هەنگاوێکیشی بۆ هەڵناهێنن تا وەدەستیان بێنن.

بۆ نمونە ئەو کەسەی ئەوە بە ئامانج دەگرێ کە لە ماوەی دوو ساڵدا خانوێك بۆ خۆی پەیدا بکات ئەوا پێویستە پلانێکی وا بۆ ئەم مەبەستە دارێژێت، کە ئەم شتانە بگرێتەوە: هەوڵ بدا پارەی بۆ کۆ بکاتەوە، هەوڵ بدا پارچە ئەرزێکی گونجاو بدۆزێتەوە، نەخشەیەکی ئەندازەیی پوختەی بۆ بکێشێ، لە گەڵ بەڵێندەرێك گرێبەند ببەستێ، پێداویستیەکان بکرێ. دەبێ رێوشوێنی هەموو ئەم هەنگاوانە بەو پەری وردەکاریەوە دیار بکات.

ئەم کەسە زۆر جیاوازی لەگەڵ ئەو کەسە هەیە کە هەر دەیەوێ خانوێك بنیات بنێ و ئیتر بیر لە هیچ شتێکی تر ناکاتەوە.

هەروەها بۆ نمونە ئەو کەسەی دانانی کتێبێك بە ئامانج دەگرێ پێویستە بابەتی کتێبەکە دەسنیشان بکات، پاشان چەند سەرچاوەیەك لەم بارەوە بەسەر بکاتەوە، ئنجا هێلکاریەکی بۆ بکێشێ کە هەمو کۆیەند و بەند و جێباس و مەسەلە و نمونە و شتەکانی تری تێدا بێ.

---

١ پراکتیك: کردەیی، عملي.

٢ پاشان بێژ: أهل التسويف، ئەوانەی کە هەر دەڵێن دوایێ وا دەکەین.

وێڕای ئەمانە لەو کاتەی پلانی هێنانەدی ئامانجەکەی دادەڕێژێ، دەبێ ئەوە لەبەرچاو بگرێ کە پلان دانانەکە پرۆسەیێکی نەرمئامێزی لۆجیکی[1] بێت، کە پاشان لەو جێباسەی دادێ بەویستی خوا بە درێژی باسی لێوە دەکەین.

٧- دوای بە ئەنجامگەیاندنی پلانەکە و دابینکردنی پێداویستیەکان و دیاریکردنی کاتی جێبەجێکردن، دەبێ جێبەجێکردنی پلانەکە لە پێناو گەیشتن بە ئامانجەکەوە بێت و لایەنی جێبەجێکار و لایەنی سەرپەرشتیکار و پێودانی پێوەری بەرەوپێشەوە چون بەرەو ئامانجەکە دیار بکرێ، رەنگە لایەنی جێبەجێکار هەمان لایەنی سەرپەرشتیکردن بێت. مرۆڤ رەنگە لەو کاتەی بەرەو ئامانجەکە دەچێتە پێشەوە گەلێ کۆسپ و تەگەرەی دێتە رێ کە وای لێدەکات هەندێ لە پلانەکانی هەموار[2] بکات و بە ئامانجە قۆناغئامێزەکانیدا بچێتەوە، کە لە سەرجەمی پرۆسەکەدا بە ئامانجە سەرەکیەکەی دەگەیەنێ.

پێویستە ئەو کەسەی کە راپەڕاندنی کارەکەی پێ سپێردراوە، بڕوایەکی پتەوی بە کارەکە هەبێ و دڵی خۆی تەواو بخاتە سەر ئەوەی کە کارەکە بەکۆتا بگەیەنێ و وا بیر بکاتەوە کە هەر خۆی تاکە بەرپرسیارە و کارەکە هەر لە ئەستۆی ئەو دایە، ئەگینا چارەنوسی کارکردنەکە بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکە نوشست دێنێ.

٨- پێویستە ئەو ئامانجەی هەوڵی وەدیهێنانی بۆ دەدەی ئامانجێك بێ، کە تۆ ئاتاجی بیت و لە پێشەوەی کارەکانی تریش دابێت.

لەوانەیە جار هەبێ مرۆڤ لە پێناو چەند ئامانجێك هەوڵ بدات، کە گشت مەرجەکانی پێشتریان لێ بێتەدی، کەچی هێندە ئاتاجیان نیە، بەڵکو ئامانجی تر هەن کە پتر ئاتاجی پێیان هەیە. وەك ئەو کەسەی کە دەیەوێ خانوێ بگرێ، تا هەفتەیەکی پشوی نیوەساڵی تێدا بەسەر بەرێ، کەچی هێشتا خانوێکی نیشتەجێبونی بۆ خۆی بنیات نەناوە تا بەدرێژایی ساڵ تێیدا بحەسێتەوە.

ئەم جۆرە حاڵەتانە تێکشێواندنی بنەمای لە پێش و لە پێشترکاریە، چونکە ئەوەی پێویستە دوا بخرێ پێشی دەخات و ئەوەی کە پێویستیشە پێشی بخات دوای دەخات. ئەگەر کەسێك ئەم حاڵەتانەی لە ژیاندا زۆر بێت، رەنگە وای لێبێ کە لە تەواوی ژیانیدا

---

١ پرۆس: عملیە: نەرمئامێزی: مرونة. لۆجیك: مەنطیقی.

٢ هەموار: تعدیل.

هەر بە شتی بێنرخ و بچوك بچوك خەریك بێ، کەچی دەیتوانی کاری تر ئـەنجام بـدات و چەندین شوێنەواری چاك بەجێ بهێڵێ، کە هەم خۆی و هەم خەڵکیش چ لە دنیا و چ لـە دواییدا سود و بەهرەی لیٚ وەرگرن.

لێرەدا دەبێ ئاماژە بە مەسەلەیەکی تریش بکەین، کە ئەویش ئەمەیە: پێویستە ئەو کەسەی کە ئامانجەکانی دیاری دەکات و هەوڵیان بۆ دەدا تا بێنـە دی، خـاوەن تـەما و هیوایەکی گەورە بێ و شەیدای کارە بەرز و گرنگـەکان بـێ، چونکـە ژیـان سـنوردارە و دەرفەتەکانیش رەنگە دوبارە نەبنەوە.

جا ئەو کەسەی ژیانەکەی لە خەریکبون بە شتە بێ بەها و بچوکەکانی ژیـان بەسـەر دەبات، ئەوا هەر لە بنـاری ژیـاندا دەمێنێتـەوە و قـەت پێـی نـاکرێ بـەرەو لوتکـە و ترۆپکەکەی بەرز بێتەوە.

بۆ نمونە یەکێك زۆر زۆر زیرەك بـێ و بـە پلـەی نایـاب قۆنـاغی ئامـادەیی بـبڕێ و تواناشی هەبێ درێژە بە خوێندنەکەی بدات، تا ئەوەی بڕوانامەی دکتۆرا وەدەست دێنێ، بەڵام ئەو هەر بەوەندە خۆی رازی دەکات، کە قۆناغی ئامادەیی تەواو کردوە و دەیـەوێ ئیشێکی سنوردار بۆ خۆی بدۆزێتەوە.

کەواتە ئەم کەسە تواناکـانی خـۆی کوشـت و لێـهاتویی خـۆی زینـدە بـەچاڵ کـرد. هۆیەکەشـی ئەمەیـە، کـە ئـەو ئامـانجی نـزم و بچوکـی بـۆ خـۆی هـەڵبژاردوە و تەماخوازیەکانی سنوردار کردوە.

هەروەها ئەو کەسەش کەکاتەکانی خۆی لە رابـواردن و بێکـاری بەسـەر دەبـا و لـە کۆڕی تەمبەڵ و دەسبەتاڵان دادەنیشێ، خۆ ئەگەر کاتەکانی لـە پەرسـتنی پـەروەردگار بەرێ بکات و نوێژ بکات و قورئان بخوێنێ و سەردانی بێوەژن و هەژار و هەتیوان بکـات و هەوڵدا پیشەیەك فـێر ببـێ و رزقێکـی حـەڵاڵ پـەیدا بکـات؛ ئـەوا حـاڵی بـەم رۆژە نەدەگەیشت و ژیانێکی پاك و پوختە و پڕ لە بەرهەمی دەبو، بەڵام ئەویش خۆی بە شتی نزم رازی کردوە و تەمای لەخۆ داماڵیوە. خوای گەورەش دەفەرموێ: ﴿حَتَّى إِذَا جَـــاءَ أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ،لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ: تا کاتێ کـە مـردن دێتە سەر یەکێکیان، ئەوسا دەڵێ: ئەی پەروەرندەم، وەم گێڕە. بەشکو ئەو کارە چاکـەی لێی نەبان بوم ئەوجار بیکەم.﴾ المؤمنون/٩٩-١٠٠.

٩- ئەگەر ئامانجە گشتیەکەت دیاری کرد و هەمو سیفەت و مەرجەکانی پێشوی لێ هاتەدی، ئەوا پێویستە ئامانجە گشتیەکە بەسەر چەند پارچە ئامانجێکی بچوك بچوکی قۆناغئامێز دابەش بکەی، بەجۆرێك کە هەر یەکێك لەم ئامانجانە بێنیە دی، پتر لە وەدیهێنانی ئامانجە گشتیەکە نزیك ببیەوە، تا ئەو کاتەی تەواوی ئامانجەکەت هێدی هێدی لەگەڵ هاتنەدی ئامانجە بچوك بچوکە قۆناغئامێزەکان دێتەدی. جا دوای ئەوەی ئامانجە سەرەکی و گشتیەکەت بەسەر چەندین ئامانجی قۆناغ ئامێزی بچوك بچوك دابەش کردوە، پێویستە بۆ هەر یەك لەم بەشە ئامانجانەش هەنگاوە پراکتیکیەکان دیاری بکەی، کە دەبنە مایەی وەدیهێنانی هەر یەك لە ئامانجە قۆناغئامێزەکان بەسەربەخۆیی.

بۆ نمونە ئەگەر یەکێك بەنیاز بێ لە بارەی هونەرێکی دیاریکراوی بابەتێکی دەستنیشانکراوەوە کتێبێك دابنێ، ئەوا پێویستی بە چەند ئامانجێکی قۆناغئامێز دەبێ، تا بتوانێ ئەم ئامانجە بێنێتە دی، کە ئەمانەن:

١-دارشتنی هێلکاریەك بۆ کتێبەکە.

٢-کۆکردنەوەی سەرچاوە و ژێدەرەکانی.

٣-نوسین و ئامادەکردنی.

٤-چاپکردن و بڵاوکردنەوەی.

جا هەر یەك لەم ئامانجە قۆناغئامێزانەش پێویستی بە چەندین هەنگاوی پراکتیکانە هەیە، تا بێتە دی.

بۆ نمونە ئامانجی کێشانی هێلکاریەك بۆ کتێبەکە پێویستی بەم هەنگاوانە هەیە:

١-هەمو ئەو باسنامانەی کە پێشتر لە بارەی ئەم بابەتەوە نوسراون، بەسەر بکاتەوە و سەیریان بکات.

٢-هەمو ئەو لێکۆڵینەوە و مەسەلانەی، کە پەیوەندیان بە بابەتەکەوە هەیە و ئەو دەیاندۆزێتەوە لەلای خۆیەوە تۆماریان بکات.

٣-ئەو کتێبانە بخوێنێتەوە کە تایبەتن بە رێگاکانی باسنامە نوسین و هەر شتێکیش پەیوەندی بە بابەتەکەی ئەمەوە هەبێ لە لای خۆیەوە تۆماریان بکات.

٤-ئەو شتانەی بە پەرت و بڵاویەوە نوسیویەتی، کۆیان بکاتەوە و رێکیان بخات و لەگەڵ یەکیان بگونجێنێ و شێوازیان پێ ببەخشێ.

٥-ئەو هێلکاریەی کە کێشاویەتی بە چەندین پسپۆری ئەم بوارەی ئەو لــە بارەیــەوە دەنوسی، نیشان بدات کە لە خۆی زاناترن.

٦-سود لە تێبینی و ئاراستەکانیان وەرگرێ و دوا وێنەی هێلکاری کتێبەکەی ئامادە بکات.

ئامانجی کۆکردنەوەی سەرچاوە و ژێدەرەکانیش ئەم هەنگاوانەی پێویستە:

١-کتێبخانە تایبەتیەکەی خۆی بپشکنێ و هەر سەرچاوەیەکی دۆزیەوە و پــەیوەندی بە بابەتەکەیەوە هەبێ، لەلای خۆیەوە تۆماریان بکات.

٢-سەردانی زۆرترین کتێبخانە بازرگانیەکان بکات و لە نێویاندا سۆراخی ســەرچاوە پەیوەندارەکان بکات و هەرچی پێویستی پێی بێ بیانکڕێ.

٣-لە کتێبخانە گشتیەکاندا سۆراخ بکات و سەیری پێڕســتەکانیان بکــات و لــەلای خۆی تۆمار بکات. هەرچی پەیوەندی بە بابەتەکەیەوە هەبێ تۆماریان بکات.

٤-سەردانی کتێبخانە تایبەتیەکانی برادەرەکانی بکــات و هــەر شــتێکی پــەیوەندی بەبابەتەکەیەوە هەبێ بیانخوازێ.

٥-سەیری پێڕستی ئەو سەرچاوانە بکات، کە لەگەڵ بابەتەکەی ئەودا تێك دەکەنــەوە و شتە پەیوەندارەکان لەلای خۆی تۆمار بکات.

٦-سەیری پێڕستی دەزگاکــانی بڵاوکردنــەوە و باســنامە زانکۆییــەکان بکــات، کــە هەڵبەت سەرچاوەی سودبەخشیان تێدا وەدی دەکات[1].

پاشان بچێتە سەر سێیەم ئامانجی قۆناغئامێز، کە بریتیە لە نوســین و ئامــادەکردنی کتێبەکە، کە ئەویش چەندین هەنگاوی پراکتیکانەی هەیە، کە دەبێتە مایــەی وەئــەنجام گەیاندنی.

پاشــان بچێتــە ســەر چوارەم ئامــانجی قۆناغئــامێز، کــە بریتیــە لــە چــاپکردن و بڵاوکردنەوەی کتێبەکە، کە هەڵبەت ئەویش کۆمەڵێك هەنگاوی پراکتیکانەی هەیە.

لەبەر ئەوە هەنگاوە کرداریەکانی ئەم دو ئامانجەم باس کردوە، تا ببێتە سەرمەشقێك

١ لێرەدا پێویستە ئاماژە بەمەش بکرێ دەتوانرێ سودێکی ئێجگار زۆریش لە دیارترین دیاردەی تەکنۆلۆجیا کە ئەنتەرنێتە ببینرێت، چونکە ئەنتەرنێت ئاسۆیەکی بەرفرەوان بۆ ئەم مەسەلەیە و مەسەلەکانی تریش واڵا دەکا، متمانە نەکردنیش لەسەر ئەنتەرنێت لە بابەتێکی ئاوادا هەڵبەت گەلێ شتی بە نرخ و گرنگ لەدەست دەدات. وەرگێڕ

بۆ ئەوانی تریش و هەروەها باسەکەشمان درێژدادڕ دەرنەچێ.

جا ئەگەر هەر چوار ئامانجە قۆناغنامێزەکانت لەرێی هەنگاوە کرداریەکانیەوە وەدی هێنا ئەوا تۆ بە ئامانجی سەرەکی بابەتەکەت گەیشتوی، کە بریتیە لە دانانی کتێبێك لە بارەی بابەتێکی دیاریکراوەوە لە زانستێك لە زانستەکان.

شتێکی تر کەوپێویستە لەبارەی ئامانجە قۆناغدارەکان و هەنگاوە کرداریەکانیانەوە تێبینیان لێوە بکرێ، ئەویش ئەوەیە کە بۆ هەمو هەنگاوەکان جێدارێك[1] یا پتر لە جێدارێکیان بۆ هەبێ بەجۆرێك، کە ئەگەر لە هەنگاوێك بالاّ دەست نەبوی هەولّ بدەی بەهۆی جێدارەکەوە بەرەو پێشەوە بچیت. جا با هەمیشە ئامانجی جێدارت هەبێ تا هەمیشە هەولّ و کرد و کۆشەکانت بەرهەمیان هەبێ.

بۆ نمونە ئەگەر دوای ئەوەی سۆراخ و کار و ماندوبونێکی زۆرت کردوە بینیت بابەتەکە کتێبێکی لەبارەوە نوسراوە یان بۆت دەرکەوت ئەو بڕە زانیاریەی بەردەستت کەوتون کتێبێکیان لیّ دەرناچیّ؛ ئەو کات لە جیاتی ئەوەی کتێبێك دابنێی دەتوانی مەقالەیەك یان باسێکی زانستیانەی لە بارەوە بنوسی و لە گۆڤارێکی خولیدا بلاّوی بکەیەوە.

ئەم نمونەیەی کە بە تێر و تەسەلی رونم کردەوە دەکرێ هەندێ شتی لەسەر هەر ئامانجێك جێبەجێ بکرێ کە تۆ دەتەوێ لە ژیاندا بیهێنیە دی بەلاّم بە شێوەیەك لەگەلّی بگونجێ.

١٠- یەکێك لە هۆکارەکانی سەرکەوتن لە هێنانەدی ئامانجەکان ئەوەیە کە نهێنیەکەی بپارێزیت و ئەو کەسانەش کە پێویست نیە بزانن با نەزانن بۆچ هەولّ دەدەیت و چ کارێ ئەنجام دەدەی، لە ئەسەریشدا هاتوە کە دەلّێ: ((کارەکانی خۆتان بە نهێنی ئەنجام بدەن))[2]. ئەو کەسەی کە ناتوانێ نهێنیەکانی خۆشی بپارێزێ با گلەیی لەوانە نەکات کە نهێنیەکەی ئاشکرا دەکەن. ئاشکرایە کە چەندین ئامانج بەفیڕۆ دراون و نوشستیان هێناوە و دزراون هەر لەبەر ئەوەی نهێنیەکانیان لە دەمی خاوەنەکانەوە ئاشکرا بووە..

---

١ جێدار: بدیل

٢ إستعینوا علی قضاء حوائجکم بالکتمان.

# ڕێکخستنی ژیان مەرجێکە بۆ سەرکەوتنی

خوای بەرز و بالاّ دەست گەردونی بە سیستەمێکی نێجگار ڕێکوپێك و وردەکار بنیات ناوە و، هیچ جۆرە شلەژان و بێسەروبەریەکی تێدا نیە، وەك دەفەرموێ: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ فَقَدَّرَهُ تَقْدِيرًا: هەموو شتی لە رادەی خۆی دروست کرد و ئەندازەی گرت.﴾الفرقان/٢. هەروەها دەفەرموێ: ﴿سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الأَعْلَى، الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّى، وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَى: پەسنی ناوی پەروەرندەی هەرە پایەبەرزت بدە، ئەوە دنیای دامەزراند و لەباریکرد، بۆ هەر شت ئەندازەی دانا و ڕێی نیشاندا﴾ الاعلی/١،٢،٣.

هەر بەم تۆکمەییە و لەبەر حیکمەتێکی هەرە بالاّ خوای بالاّ دەست وەك ئەزموناندن و تاقیکردنەوە، ئەندازەیەك لە ئازادی و سەرپشکێتی بە مرۆڤ بەخشیوە. مرۆڤ بەهۆی ئەم هێندە ئازادیەوە دەتوانێ ژیانی خۆی ڕێك بخات، یان بێسەر و بەری و تێکشێواندنی تێ بخات. هەمو شتەکانی دەوروبەری ژیانی مرۆڤ لەو پەڕی ڕێکوپێکی دان، هەر لە گەردیلەوە بگرە، تا سوڕانەوەی شەو و ڕۆژ و جیاوازی نێوان وەرزەکانی ساڵ و کەش و هەوا، تا پێگەیشتنی درەخت و میوە و لە دایکبونی گیانلەبەران. ڕێکوپێکیی ئەدگار و ناونیشانی تەواوی گەردون هەر لە گەردیلەوە تا کەشکەشان.

شەرعی خواش لە ئامۆژ و حوکمە عیبادی و رەفتاریەکانیدا تەواو تەواو ئەم ڕاستیە گەردونیەی تێدا بەرجەستە بوە.

جا ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ دەوروبەرە ڕێکوپێکەکەی هاوەدەنگ نەبێ و بەسای ئەو ئازادیەی خوا پێی بەخشیوە ژیانی خۆی ڕێکوپێك نەخات، ئەوا بێگومان ژیانەکەی دەبێتە تێکشێوان و شلەژان و ململانێ کردن لەگەڵ تەواوی بونەوەران.. دەبێتە تەنگی و شەکەتی و نەگبەتی.. دەبێتە داتەپین و کەمی بەرهەم هێنان و بودەڵەیی بەخشین لە کارەکانیدا. تا لە ئەنجامدا دوچاری بێهیوایی و بێ ورەیی و گرژی و دوودڵی دەبێت، بەتایبەتی لەو کاتانەی کە خۆی لەگەڵ ئەو خەڵکانە بەراورد دەکات کە هەنگاوی گەورەیان لە ژیاندا هاوێشتوە و ئەویش هەر لە شوێنی خۆی چەقیوە، سەرەنجامی هەمو ئەمانە بریتیە لە بە فیڕۆدانی کات. کە ئەویش واتا بەهەدەردانی ژیان، خوا بمانپارێزێ و هاریکارمان بێ.

دەتوانین پێناسەیەکی سادەی "ڕێکخستن" بکەین و بڵێین: بریتیە لە بەکارهێنانی ئامڕازە بەرتوانەکان(الوسائل الممکنة) بۆ وەدیهێنانی ئامانجە لەبەر نیاز گیراوەکان لەمیانەی پلانێکی پوختە و تۆکمەدا.

کە ئەمەش وا دەخوازێ لە سێ شتدا زانیاری هەبێ:

١-قەبارەی ئامڕازە(وسائل) خوازراوەکان.

٢-زانینی گرنگی هەر ئامڕازێك.

٣-زانین و دیاریکردنی شوێنی هەر ئامڕازێك لە کارەکاندا.

٤-کۆنترۆڵکردنی[1] ئەو کاتەی، کە هەر ئامڕازێك پێویستیەتی.

بەر لە هەمو ئەمانەش داڕشتنی ئامانجەکان بەوریاییەوە، دەبێ ئەمانە هەمویان لەمیانەی پلانێکی رون و ئاشکرادا بێت.

## هەندێ لە هۆیەکانی بێسەر و بەری و ناڕێکوپێکی لە ژیاندا:

١-بەسوك وەرگرتنی سود وەرگرتن لە کاتدا و بەفیڕۆدانی لە کاروبارە کەمبایەخەکاندا. گەورەترین بەڵا، کە توشی پیاوی ژیر دەبێ بەفیڕۆدانی کاتە، چونکە ئەو چرکە ساتەی تێدەپەڕێ هەرگیز گەڕانەوەی بۆ نیە.. لە ئەسەریشدا هاتوە کە دەڵێ: هەر ڕۆژێ کە بەیانی لێ دەبێتەوە بانگدەرێك بانگ دەکا و دەڵێ: ئادەمیزاد! من وەدیهێنراوێکی تازەم و بینەری کردەوەکانتم، تا ڕۆژی ڕابونەوە(قیامة) نامبینیەوە، بۆیە تاپێت دەکرێ پتر خێرم تێدا بکە. هەڵبەت مرۆی ژیر دەزانێ کە کات بریتیە لە هەناسەکانی و هەر خولەکێکیش کە بەسەر دەچێ کەمبونەوەیەکە لە ژیانیدا، وەکو شاعیر دەڵێ:

دقات قلب المرء قائلة له　　　إن الحياة دقائق و ثوان[2]

بۆیە مرۆی ژیر لە ژیاندا رادەپەڕێ و لە هەمو چرکەیەکی ژیانیدا باشترین و شایەنترین بەروبوم دەچنێ، چونکە دەزانێ لە ڕۆژی لێپرسینەوەدا خوا لە تەمەنی بەسەرچو و لە گەنجایەتی ڕابردەی دەپرسێتەوە.

---

١ کۆنترۆڵ: ضبط

٢ واتە: ترپەکانی دڵ بەمرۆ دەڵێ　　ژیان هەر بریتیە لە خولەك و چرکەکان

بەڵام خەڵکانی بێسەروبەر و تەمبەڵ و دەسبەتاڵ هیچ شتێکیان پێ لە کات بێنرختر نیە و بێ باکانە لە بێئاگایی و شتە کەم بایەخەکان بەفیڕۆی دەدەن و بیر لەوە ناکەنەوە سودێکی لێ وەدەست بێنن، بگرە دەیانەوێ بیکوژن. ئەم داماوانە نازانن کە دەیانەوێ کات بکوژن خۆ دەکوژن، لە مێژیشە گوتراوە: کات وەك شمشێرە گەر نەیبڕی ئەو دەتبڕێ. هەمو کەس و نەتەوەیەکیش ئەو کاتەی کە درکیان بە گرنگی و نرخی کات کردوە و دەستپێشخەرییان هەبوە، تا پێیان کراوە لێی بەهرەمەند بونە؛ لە پێش کەسان و گەلانی تریان داوەتەوە. چەند جوانە کە پیاوچاکێك لە وەڵامی هاوەڵەکەی کە بۆ چەند کاروبارێکی کات بەفیڕۆدەر بانگی دەکات دەڵێ: باشە، دەتۆ خۆرم بۆ راگرە تا لەگەڵت بێم.

تۆ ئەگەر دەرونەکەت وا راهێنا کە سوربێ لەسەر ئەوەی سود لە کاتەکان وەرگرێ و بەفیڕۆیان نەدا ئەوا دەبێتە مایەی رێکخستنی کاتی گشتی کاروبارەکانی ژیانت.

بۆیە با ئەمە ببێتە پەندێك لە پەندەکانی ژیانت کە (کات بریتیە لە ژیان بۆیە بەفیڕۆی مەدە و یارمەتی کەسانی تریش بدە تا لێی بەهرەمەند بن).

٢-جیانەکردنەوەی گرنگ و گرنگتر. هەندێ کەس هەن، خۆیان بە شتە کەمالی و لاوەکی و سوننەت و موباحەکان خەریك دەکەن و کاتەکانیان بۆ تەرخان دەکەن، کەچی لە شتە زەروری و هەموەکی و فەرز و واجبەکانیش بێبایەخن و کات بەفیڕۆ دەدەن.

وەك ئەو کەسەی کە کرد و کۆش دەکا و هەمو توانایەکی خۆی بۆ ڕەنگاندنی خانوەکەی بە ڕەنگی جۆراوجۆر تەرخان دەکات، کەچی کەمتەرخەمیەکی گەورەش لەمەڕ بناغە و کۆڵەگە و دیوارەکانی دەنوێنێ، تا ئەو ڕۆژەی خانوەکەی بەسەردا دەڕوخێ و ئەوەی لەناویەتی دەیکوژێ، ئەو کات، نە ڕەنگاوڕەنگی خانوەکەی و نە ڕەونەقی بۆیەکەش ڕزگاری دەکەن.

ئا بەمجۆرە هەندێ کەس وەدوی ڕواڵەتی پوچ و دیمەنی درۆینە و بۆنە و وتە ڕەونەقدارەکان کەوتون، تۆ ئەگەر ژیانی ئەم جۆرە کەسانە بپشکنی و بتەوێ زانستێکی تۆکمە و کردەوەیەکی پاك و پوختە بدۆزیەوە زۆر ماندو دەبی و نایاندۆزیتەوە، مەگەر چۆن!.

ئەمجۆرە کەسانە ئەگەرچی ماوەیەکی ژیانیان بە عەیش و نۆش و کەشخەیی ڕادەبوێرن بەڵام کە ئەمجۆرە ژیانە ماڵئاواییان لێ دەکات و خەڵك لە یادی کردن، یان کە

به ئەجەل دەگەن و بەرەو ئاخیرەت دەچن، ئەو کات هەست بەوە دەکەن، کە هــەرچی لــە ژیاندا کردویانە وەك کەفەژیلکەی دەریا رامالّدراون و پوکاونەتەوە تەنـها چاکـە و کـارە باشەکانیان نەبێ کە هەر ئەوانـەیان بـۆ ماوەتـەوە بـەهانایان بێـن. یـەکێك لـەو تـیرە کوشندانەی، کە ناهەق لە مرۆڤە چالاك و بەجۆش و خرۆشەکانی دەگرێ ئەوەیە، کە روو لە کاروبارە بالاّ و بەها بەرزەکان وەردەسورێنن و هەرچی چالاکی و گرجوگۆڵی هەیانە لە شتە بچوکەکانی ژیانی سەرف دەکەن، تا ئەوەی شتە بچوکەکانیان لە ژیاندا ئێجگار زۆر دەبێ و هەر لە چاوەڕوانی شتە گەورەکانیشدا دەبن، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان پێیـان بگـات، ئیتر لە ئەنجامدا ژیانەکەیان لیّ دەبێتە بێسەر و بەری و تێکشێوان و شڵەژانی.

گەلیّ زۆرن ئەو پیاوانەی بەشتە بچوکەکانی ژیان خەریکن، بەلاّم ڕێگای کارە بەرز و مەزنەکان ڕێبواریان گەلیّ کەمە، دەی تۆ ئەگەر خاوەنی هۆش و پەرۆش و بڕیـاری دڵـی ئەم ڕێگایە بگرە بەر.

٣-خراپی کات دانانەوە بۆ ئەنجامدانی کارەکان جا، یان کارەکە لە پێشوەختە ئـەنجام دەدات، یان دوای ئەوەی کاتەکەی بەسەر دەچێ. ئەبوبەکری سددیق ﷺ چەند جوانی بــە عومەری کوڕی خەتتاب ﷺ گوتوە، کە دەڵێ: عومەر بزانە! هەندێ کاری شەوانە هەیــە خوا بە ڕۆژ قبوڵی ناکات، هەندێ کاری ڕۆژانەش هەیە خوا بەشەو قبوڵی ناکات.

هەر کەسێك لەم گەردونە رامێنێ و وردبێتەوە، دەزانێ کە خوا بۆ هــەمو بونـەوەرێ کاتێکی دیاریکراوی داناوە بێ ئەوەی لە پێش و لە پـاش بـدەن، وەکـو بـەدوای یـەکدا هاتنی شەو و ڕۆژ و هەلاّتن و ئاوابونی خۆر و جیـاوازی چـوار وەرزە و بـەرگرتنی دار و درەخت و زۆربونی گیانلەبەران و هەمو شتەکانی تریش.

خوای گەورە هەر بەپێی ئەم دام و دەستورەوە یاسای خـۆی دابـەزاندوە و بـۆ هــەمو کارەکانی وەکو: نوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکات، کاتی دیاری کراوی بڕیار داوە. جا مــرۆڤ دەبێ لەگەڵ ئەم گەردونە هاوساز بێ و بەپێی بنەماکانی ئـەم سروشـە مەزنـەوە ژیـانی خۆی ڕێکوپێك بخات و هەمو شتێ لە شـوێنی گونجـاوی خـۆی دابنـێ. ڕەفتـارکردن بــە پێچەوانەی ئەم ڕێسایە، هیچ سودێ نابەخشێ و ڕەنج بەخەسارییە و کـات بـە فیڕۆدانـە وەکو ئەو کەسەی، کە دەیەوێ پێشوەخت بەروبوم بچنێ!.

هەرکەسێ ئەگەر چی ماندوش بێ و کارێکی بێ پسانەوەش بکات، بەڵام ئەگەر کارەکانی خۆی بەکاتی دیاریکراو کۆنترۆڵ نەکرد و کردیە بێسەروبەری ئەوا هەڵبەت هیچ بەروبومێ لە کارەکانی ناچنێ.

٤-تەواونەکردنی کارەکە. زۆر کەس دەست پێدەکەن چەند کارێ، یان چەند پرۆژەیەك ئەنجام بدەن و چەند هەنگاوێکیشی بۆ هەڵئەنێن، کەچی بەر لە تەواوبونیان وازیان لێ دێنن و ڕودەکەنە چەند پرۆژە و کارێکی تر، بەجۆرە لەسەر کارێك یان پرۆژەیەکی دیاریکراو ناگیرسێنەوە تا بەئەنجامی بگەیەنن، هەمو ژیانیان لە داچاندن بەرێ دەکەن ناگەنە ئەو ڕۆژەی بەرەکەی بدورنەوە.

ئابەم جۆرە کارەکانیان لەسەر زۆر دەبێ و بارقورستر دەبن، ئاشکراشە کە ژیان سنورداره و توانا بەردەستەکانیش نەبڕاوە نین.

ئەوانە وەدوای تراویلکە[1] وێڵن و ڕۆژانی ژیانیان لەم ڕێیە بەرێ دەکەن.

٥-دوبارەکردنەوەی کارێك پتر لە جارێ، لەبەر ئەوەی وا تێدەگات پێشتر کارەکەی ئەنجام نەداوە. بۆ نمونە ئەو کەسەی کە باسنامەیەکی زانستی ئامادە دەکات پاشان لە شوێنێکی تر بەهەمان فەرمودە رادەبورێتەوە، دیسان تەخریجی دەکاتەوە پاشان بۆ جاری سێیەمیش هەروا ڕەنگە زیاتریش. بەم جۆرە کات بەفیڕۆ دەدات و گەلێ کرد و کۆش بەهەدەر دەبات، بێئەوەی ئەنجامێکی نوێ وەدەست بێنێ.

ڕاهاتن لەسەر دوبارە و سێ بارە کردنەوەیەکی ناپێویست بۆ هەر کردەوەیەك، دەبێتە مایەی کەمبونەوەی بەرهەمی مرۆڤ لە ژیاندا و، بەهۆیەوە گەلێ دەرفەتی وا لە دەست دەدات، کە دەیتوانی کاری تریان تێدا بکات، کە هەم بۆ دنیا و هەم بۆ ئاخیرەتیش بەهرەی هەبوایە.

هەر چەندە ئەم کارە هەر خۆی دەرەنجامێکی بێسەر و بەرانەیە لە ژیاندا، بەڵام ڕاهاتن لەسەری، ئەمیش دەبێتە هۆیەك بۆ بەدواداهاتنی کۆمەڵێك بێسەر و بەری تری تازە لە کارەکاندا. بۆیە لە مێژە گوتراوە: خراپە خراپەی لێ دەکەوتەوە و چاکەش ڕێخۆشکەرە بۆ چاکەی تر.

---

[1] تراویلکە: سراب

٦-ڕیزنەکردنی ئەو کارانەی کـە جێبـەجێ دەکرێـن و ئـەنجام دەدرێـن بەشـێوەیەکی لۆجیکانە[١] و ڕێکوپێکانە. هەندێ کەس کەکارەکانیان ئـەنجام دەدەن گـوێ بـەوە نـادەن داخوا لە پێشەکیەوە، یان پاشەکیەوە ڕا دەست پێ بکەن، وەکـو ئـەو کەسـەی کـە لـە دروستکردنی خانوەکەیدا، بـەر لـەوەی کـار بـۆ ئامادەسـازیەکانی بناغـە و کەرەسـتە بنچینەییەکان بکات هەڵدەستێ پێداویستیەکانی بنمیچ ئامادە دەکات.

یا وەك ئەو کەسەی کە خۆی بۆ چنینی بەروبوم ئامادە دەکـات، کـەچی هێشـتا نـە زەویەکەی داچاندوە و نە درەختەکانیشی چاندوە.

بەڵێ، خۆ ئامادەکردن بۆ کارەکان بەر لەوەی لە ناکاو روت تێ بکەن، یان بەر لەوەی کاتەکەیان تەنگ بێتەوە، شتێکی چاکە و خوازراوە، بەڵام ئەمە دەبێ دوای ئـەوەبێ کـە ئەو کارانەی پێویستن لە پیشدا بکرێن-چ لە ڕوی زەمەنەوە، چ لە روی عەقلیەوە، چ لـە ڕوی لۆجیکەوە- ئەنجام بدرێن. ئەگەر نا مرۆڤ گەلێ لـە کاتـەکانی و زۆر لـە هـەوڵ و تواناکانی خۆی بۆ کاری وا تەرخان دەکات، کە ڕەنگە هیـچ سـودێکی لێ نەکەوێتـەوە، لەبەر ئەوەی لە کات و شوێنە گونجاوی خـۆی تـەرخان نـەکراون، بۆیـە بـە ناچـاری بـە کارەکاندا هەڵدەچێتەوە و دوبارەیان دەکاتەوە. خۆ ئەگەر کەمێك بوەستایە و هەوڵەکانی ڕێکوپێك بکردایە ئەوا ئەم هەمو هەوڵ و توانایانەی لە دەست نەدەدا و شتەکانی بەفیڕۆ نـەدەچون. بێگومـان هۆیەکەشـی بـۆ بێسـەروبەری و هەرەمـەکی و گـەرە لاوژێتـی دەگەڕێتەوە. درود و سلاو لەسەر پێغەمبەر بێ، کە فەرموویەتی: (( **إن الله يحب مـن أحدكم إذا عمل عملاً أن يتقنه**. واتە خوا ئەو کەسەی خۆش دەوێ، کە ئەگەر کـارێکی کرد بە پوختەیی بیکات )).

٧-ڕاپەڕاندنی کارەکان بە شێوەیەکی سەرپێیانە و نەبونی پلانی پێشوەختە.

بێگومان ئەمە یەکێکە لە گرنگترین هۆیەکانی بێسەروبەری لە ژیـاندا و وا دەکـات مرۆڤ ژیانی خۆی پێ ڕێك نەخرێت.

چونکە بەهۆی پلانەوە مرۆڤ دەتوانێ لەهەمو کارەکانیدا ئامانج و ئەو ئامرازانەی[٢] کە ئامانجەکە وەدی دێنن و ئەو چۆنیەتـەی، کـە ئامڕازەکـانی تێـدا بـەکاردێت و ئـەو

---

١ لۆجیك: ژیربێژی- منطقي.

شوێنەش دیاری بکات، کە کارەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت.

نەبونی پلان دەبێتە مایەی بەخەسارچونی ڕەنجێکی زۆر و تێکشێوان و رابورین بەنێو تاریکاییدا کە ئەوسەر و ئەنجامەکەی دیار نەبێ. جا لەبەر ئەوەی پلان دانان کارێکی فرە گرنگە لە ژیانی تاك و کۆمەڵدا بۆیە چەند شتێکی لێ دەدوێین.

## چۆن ڕۆژەکەت ڕێك و پێك دەخەی؟

مرۆڤ ئەگەر لە ڕێکخستنی ژیانی ڕۆژانەی سەرکەوتو بو، ئەوا لە تەواوی ژیانیدا سەرکەوتو دەبێ. زۆر کەس هەن ڕۆژانە ڕوبەروی بارقورسیەکانی ژیان دەبنەوە بێئەوەی ڕێکخستنێکیان بۆ مەسەلەکان هەبێ، یان پلانێکیان بۆ کردەوەکان دارشتبێ، بۆیە تەواو خۆیان شەکەت دەکەن، کەچی بە ئامانجەکانیشیان ناگەن. جا من لێرەدا تاکو بتوانم یارمەتیەکی خوێنەرانی هێژا بدەم، بۆ ئەوەی ژیانی ڕۆژانەیان ڕێك بخەن؛ چەند هزرێك[1] دەخەمە ڕوو بەو هومێدەی ببێتە بەرنامە و خشتەی کارەکانیان:

١-ئێوارەی ڕۆژی پێشتر، یان بەیانی هەمان ڕۆژ لیستەیەك بۆ کارەکانی ئەو ڕۆژەت ئامادە بکە و، لیستەکەت لە گیرفان هەڵگرە، جا هەر کارێکت ئەنجام دا ئەوا نوکە قەڵەمێکی بگەیەنێ و نیشانەیەکی لەتەك بدە.

٢-دەستەواژەکان بە کورتی بنوسە و هەر ئەوەندە بێ، کە کارەکانت بەبیر بێنێتەوە.

٣-بۆ هەر کارێك لە کارەکان، کاتێکی پڕ بە پێست و سەرەتا و کۆتاییەکەشی دیاری بکە.

٤-کارەکان بە شێوەیەکی جوگرافیانە دابەش بکە، واتە ئەو کارانەی کە لەیەك شوێنن، یان لە نزیك یەکترن بیانکە بە گروپ گروپ، تا بەڵکو کارەکانی هەر گروپێك دوا بە دوای یەکتر ئەنجامیان بدەی و سەرەنجام، کاتێکی زۆرت بۆ بگەڕێتەوە.

٥-لیستەکەت بەشێوەیەکی وا دانێ کە بتوانی کەمی کەیتەوە یان زیادەی بخەیە سەر ئەگەر پێویستی وای خواست.

---

[1] هزر: بیر- فکر

٦-له بەرنامەکەتدا چەند کاتێکیش بۆ حاڵەتە نائاسایی و ناکاویەکان دابنـێ وەکـو سەردانی میوانێك بێئەوەی مەوعیدی وەرگرتبێ، یـان منداڵێکـت توشـی نەخۆشـیەکی لەناکاو دەبێ، یان ترومبێلەکەت لە ڕێگادا تێکدەچێ یان...

٧-پـەراوێزی هـەندێ لـە کـارە درێژخایەنـەکانت بەکاربێنـە بـۆ ئـەنجامدانی کـارە کورتەکان، بۆ نمونە، لەکاتی چاوەڕێ کردنتدا لە سەردانگەی[1] دکتۆردا کتێبێ بخوێنـەوە، یان نامەیەك بنوسە، یان بەهۆی پەیوەندی تەلەفۆنیەوە چەند کارێکت راپەڕێنی.

٨-ئەگەر بەرنامەی کارەکانت بەشێوەیەکی سەرپشکانە بوو، ئەوا جۆراوجۆرێتی بخـە نێو کارەکانتەوە تاکو توشی بێزاری نەبیت. با هەندێ لە کارەکانت تاکەکەسی بـن و بـا هەندێکیش خێزانی بن و ئەوانی تریش با دەرەوەیی بن و ئیتر بەم جۆرە..

٩-با بەشێك لە بەرنامە ڕۆژانەییەکەت بۆ پرۆژە گـەورەکان بـن وەکـو: پـەرەپێدانی خودی خوت و رۆشنبیریت، یا وەکو بیرکردنەوەیەکی هێمنانە لە پرۆژەکانی داهاتوت یان شتی هاوشێوە.

١٠-وا باشترە فۆرمێکی گونجاو ئامادە بکەی، هەمو ڕۆژێ بەرنامە ڕۆژانەیـیـەکانی لەسەر بنوسی و پاشان دانەیەکی لێ کۆپی بکەی و لەناو فایلێك لەلای خۆتی هەڵگری.

❊ ❊ ❊

---

[1] سەردانگە: عیادة

# ژیانی ڕێك و پێك بەهۆی پلانەوە دێتە دی

پێشتر ئاماژەمان بەوە دا کە، پلان دانان مەرجێکە بۆ ئەوەی لە ژیاندا بە ڕێکوپێکی و دور لە بێسەروبەری و تێکشێوان هەنگاو هەڵێنی. پلان دانانیش گەلێك ڕێبیر و ڕێکخەری بۆ دانراوە و چەندین توێژینەوەی لەسەر کراوە، کە هاوچەرخەکان زۆر بە فرەوانی لە بارەیەوە دواون. من لێرەدا هەر بەوەندە دەوەستم، کە چەند ڕێبیرێکی ئاسان بێنمەوە، کە دەکرێ مرۆڤ سودیان لیٚ وەرگرێ و هەولٚ بدا بەهۆیانەوە پێشکەوتنێ بخاتە ژیانی خۆی، جا ڕۆشنبیری و تواناکانی هەرچەندێ بن.

فەرمون ئێوە و ڕێبیر و ڕێشناییە[1] گشتیەکان:

١-تا لەحاڵەتی ئیسراحەت و هێمنی و هاوسەنگی مگێز[2] و هەست بە متمانە بەخۆکردندا نەبیت و دوور نەبی لە دودڵی و گرژی و ناهومێدی؛ دەست مەکە بەدارشتنی پلانەکەت بەتایبەتی لە کاروبارە گرنکەکاندا. چونکە پلان دانان پێویستی بە تەواوی هێزی بیرکردنەوە و وەبیرهاتنەوە و خەیاڵی زیهنی هەیە، ئەمەش تەنها لەم کاتەدا دێتە دی، کە مرۆڤ لە حاڵەتێکی گونجاوی زیهنی و دەرونی و جەستەییدابێت، ئەمە لە بارودۆخە ئاساییەکاندا وایە، بەڵام لە بارودۆخە ناچاریەکاندا دیارە، کە هەمو زەرورەتێك حوکمی تایبەتی خۆی هەیە.

٢-کۆکردنەوەی زانیاری لە بارەی واقیعی ئێستا و ئەو کارەی کە هەوڵی دامەزراندن، یا پەیداکردنی دەدەی.

جا پێویستە ئاشناییەکی چاکت لەگەڵ واقیعدا هەبێ و بەبێ کەم و زیاد وەسفی بکەی. چونکە واقیع دەبێتە جێڕەو (منطلق)ێك بۆ ئەو داهاتوەی، کە پلانی بۆ دەکێشی. لێرەدا مەبەستمان لە واقیعی ئەو کارە دێ کە دەتەوێ پلانی بۆ بکێشی و پەرەی پێ بدەی و ئەنجامی بدەی، نەك واقیعی تەواوی ژیان، کە ئەمە باسی تر هەڵدەگرێ. هەروەها دەبێ زانیاری لە بارەی ئەو کارەی کە پلانی بۆ دەکێشی بدۆزیەوە، جا چ لە ڕوی ئامانج و ئامراز و سودەکانی چ لە ڕوی پێویست پێ هەبونی.

---

[1] ڕێبیر: مبدأ. ڕێشنایی: کورتکراوەی ڕێ ئاشنایی: إرشاد.
[2] مگێز: میزاج

٣-دیاریکردنی ئەو ئامانجە لەبەر نیازگیراوانەی، کە لە کارەکەدا دەتەوێ پلانـی بـۆ بکێشی. با دیـاریکردنی ئامانجـەکان بـەو شـێوەیە بـێ کـە لـە جێباسـەکەی پێشـودا ئاماژەمان پێکردوە بـەو جـۆرەی، کـە ڕەچـاوی لـە پێـش و لـە پێشـترکاری بکـرێ و جێدارەکان بدۆزرێنەوە و هاوسەنگی و واقیعیانەیی و رون و ئاشکرایی و ئـەوانی تریـان تێدا بێ.

٤-زانین و کورتکردنەوەی ئـەو ئـامراز و توانـا مرۆڤانـەیی و ماددیانـەی، کـە بـۆ ڕاپەڕاندنی پلان و وەدیهێنانی ئامانجەکانی پێویستن، بزانی کە ئێستا چ شتێکیان دەست دەکەوێت و چ شتێکیان دەست ناکەون. چۆنیش پەیدا دەبن؟.

دەبێ بـە هاوسـەنگی مـەزندەی بکـات نـە بـەزۆری دانـێ و نـە بەکـەمی، دەبـێ ئامرازەکانیش ڕەوا بن و حەرام نەبن.

٥-دیاریکردنی کات و شوێنی جێبەجێکردن و ڕاپەڕاندنی کارەکە. دەبێ دیاریکردنی ئەم دوو ڕەگەزە بەو پەڕی رونیەوە بێت و هیچ تەمومژێکی تێـدا نـەبێ، چونکـە بـێ ئەمان پلانەکە کەم و کورتی دێنێ و، تا ئەوانیشی تێـدا نـەبێ؛ کـامل نـابێ. کەواتـە مەرجە شوێن و کات و ڕۆڵی هەر ئامرازێك لە ئامرازەکانی کارەکە و هەر قۆناغێك لـە قۆناغەکانیشی تێدا دیاری بکرێ.

٦-دیاریکردنی ئەو کەسەی کە کارەکە رادەپەڕێنێ، جا چ خودی کەسەکە بـێ، یـان کۆمەڵە کەسەك بن، یا چ بە دیاریکردنی وەسفە گونجاوەکانی بـن، کـە بـۆ ئـەنجامدانی کارەکە پێویستن. پاشان وەدوای ئەو کەسانە بگەڕێ کە ئەم وەسفانەیان لیٚ دێتـە جـێ و کارەکەیان وە ئەستۆ دەخرێ. چونکە هەر کارە و پێویستی بە کەسانێکی خـاوەن چـەند سیفەتێکی دیاریکراو و جیاواز هەیـە. ئاشـکرایە کـاری ئاسـنگەری چـەند سـیفەت و شارەزاییەکی وا لەکەسانێ دەخوازێ کە لە هی ئـەو کەسـانەوە جیـاوازە، کـە بـەکاری دارتاشیەوە خەریکن. هەروەها سیفەت و ئەزمونە گونجاوەکانی ئـەو کەسـانەش کـە بـە کشت و کاڵەوە خەریکن جیاوازە لەگەڵ ئەوانەی بە ئاسنگەری و دارتاشـیەوە خـەریکن، ئیتر بەمجۆرە هەر کارە و پیاوی خۆی.

**رەنگە لەبەر کۆمەڵە هۆکارێك جێبەجێکردنەکە پەکی بکەوێ:**

ا-هەڵنەژماردنی پێداویستیەکان بە وردی و چاك نەپشکنینیان و بۆ دابینکردنیشیان متمانە بخەیە سەر رێکەوت. بۆ نمونە تۆ ئەگەر مەبەستت بوو گەشتێك لەگەڵ خێزانەکەت، یان لەگەڵ کۆمەڵە برادەرێکت ئەنجام بدەی و پێداویستیەکانی گەشتەکەت بەبێ هەڵژماردنێکی هەمە لایەنە دابین بکەی، ئەوا ئەو کاتەی لە گەشتەکەدا دەگەیتە جێی مەبەست، ئیتر هەر دەمەی شتێکت بۆ دەردەکەوێ کە لەگەڵ خۆت نەتهێناوە، جا چاری ناچار دەبی سواری ترۆمبێلەکەت بیت و بگەڕێیتەوە بیهێنی، بۆ هەر شتێ دەبێ جارێك بگەڕێیتەوە تا ئەوەی کاتە کورتەکەی گەشتەکەت کۆتایی دێ، بێئەوەی چێژت وەرگرتبێ، هۆی ئەمەش ئەوەیە کە وردەکاری و هەمەلایەنیت نەبوە لە هەڵژماردن و دابینکردنی پێداویستیەکان.

ب-دابەشنەکردنی ئامراز و توانا بەردەستەکان بەسەر قۆناغەکانی کارەکەدا بەشێوەیەکی ڕاست و دروست، بەو جۆرەی هەندێ شت پێش بخەیت و هەندێکیش دوا بخەیت.

ج-شتەکان و توانا بەردەستەکان لە شوێنی گونجاودا بە شێوەیەکی رێکوپێك هەڵنەگیرێن، کە لە کاتی پێویستدا بە ئاسانی بەردەست بخرێن. وەك ئەو کەسەی کتێبخانەیەکی دەوڵەمەندی پڕ لە کتێبی هەیە، بەڵام بە نارێکی و بە بێسەروبەری هەڵیگرتون، لەم حاڵەتەدا تۆ پێویستت بەهەر کتێبێ بێت، دەبێ سۆراخێکی چاکی بۆ بکەیت و کاتێکی زۆری بۆ تەرخان بکەی، تا دەیدۆزیەوە، رەنگە لە کۆتاییدا نەشیدۆزیەوە.

د-ئالۆزی داڕشتنی پلانەکە و دوور لە سادەیی و نەرم و شلی (مرونة)، بەجۆرێك تێگەیشتن لە پلانەکە، وە زەحمەت کەوێ و تواناش نەبێ جێبەجێ بکرێ.

هـ-نەبونی گوڕ و تین و بڕوانەبون بە کارەکە، کە وا لە کرێکارەکان دەکات ببن بە خەڵکانێکی لاسایخواز و تەنها بە دیمەنی دەرەوەی کارەکە بایەخدار بن.

و-بێتوانایی کرێکاران لەسەر پراکتیزە کردنی کارەکە، لەبەر نەبونی مەشقی پڕ بە پێست.

ز-دابڕان و بەردەوام نەبون لەسەر کارەکە بە گوێرەی داخوازیەکانی پلانە داڕێژراوەکە، تا بە ئەنجام دەگات.

٧-هەروەها پێویستە پلانەکە ئەو رونکردنەوەیەشی تێدا بێ، کە کێ ئەرکی سەرپەرشتیکردنی راپەڕاندنی کارەکە دەگرێتە ئەستۆ. ئەرکەکەش ئەوەیە کە لە کارەکانی جێبەجێکارەکان بڕوانێ، کە تا چەند بە پلانی داڕێژراو پابەند بوونە. هەروەها بۆ نەهێشتنی ئەو کۆسپ و تەگەرە لابەلاییانەی دێنە رێیان، یارمەتیان بدات و توانا بەردەستە ماددی و مرۆییەکان، کە پێویستن بۆ راپەڕاندنی کارە دەسنیشان کراوەکە دابین بکات.

لەوانەیە پلان داڕێژەکە هەر خۆی جێبەجێکار و سەرپەرشت بێ، لەوانەشە هەر کارێ جیاوازی لەگەڵ کارەکانی تر هەبێ بەتایبەتی لە پرۆژە گەورەکاندا.

بۆ ئەوەی ئەو کەسەی ئەرکی جێبەجێکردن و سەرپەرشتیکردنی گرتۆتە ئەتسۆ باری سوك بێ، دەتوانرێ سود لە رێگەی کاربەخشینەوە[1] وەربگرێت، بەویستی خوا لە بابەتەکانی دادێ بە وردتر باسی دەکەین.

٨-دیاریکردنی رێگەی هەڵسەنگاندن و ئامادەکردنی راپۆرت دەربارەی ئەوەی، ئاخۆ کارەکە تا چەند بەرەو پێشەوە رۆیشتوە و، تا چەند بەپێی پلانەکە و ئەو ماوەیە هەماهەنگ بوە، کە بۆ هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی کارەکە دیاریکراوە. هەروەها ئەو پێودانانە رون بکاتەوە کە بەهۆیانەوە ئاستی سەرکەوتن و نوشستی ئەنجامدانی کارەکە دیار دەکرێ.

ئەم پێودانانەش لەسەر چوار مەسەلان وەستاون:

ا-بڕی ئەو هێندەی کە لە کارەکەدا جێبەجێ کراوە.

ب-کوالێتی (باشێتی) ئەو هێندەی جێبەجێ کراوە.

ج-بڕی ئەو هەوڵ و پارە تێچوەی لەو هێندە بەرێ کراوە.

د-بڕی ئەو ماوە زەمەنیەی، کە هێندە جێبەجێکراوەکە خایاندویەتی.

بۆ نمونە ئەگەر کارێك رێژەی ٣٠٪ی لێ جێبەجێ کرابو بە ماوەیەکی زەمەنی، کە رێژەکەی ٥٠٪ی تەواوی زەمەنی جێبەجێکردنی خایاندبو و، بە تێچوی ٤٠٪ی تەواوی

---

١ کاربەخشینەوە: التفويض.

تێچوی تەرخانکراو بۆ کارەکە؛ ئەوا بێگومان جێبەجێکردنی کارەکە بە نوشست لە قەڵەم دەدرێ، پێویستە کەم و کورتیەکە چارەسەر بکرێ.

هەروەها پێویستە ئەو لایەنەی کە ئەرکی ئامادەکردنی راپۆرتەکان و هەڵسەنگاندن و راپەراندنی دەخرێتە ئەستۆ دیاری بکرێ.

پلانی سەرکەوتو ئەو پلانەیە کە بتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە: ئێستاکە بەکوێ گەیشتوین. بۆچی؟. پێویست بو بەکوێ بگەیشتینایە؟. چۆن؟. کەی ئەمە دێتە دی؟. کێ ئەم کارە رادەپەڕێنێ؟.

## نمونەی پلان دارشتنێك بۆ کاروباری خێزانی:

١-بابەتی پلانەکە: بودجەی[١]ماڵەوە.

٢-ئامانجی پلانەکە:

ا-رێك کردنی پرۆسە(عملية)ی خەرجیی خێزان بە شێوەیەکی هاوسەنگی وا، کە لەگەڵ سەرجەم داهاتی خێزانەکە بگونجێ.

ب-خەرجکردنێکی هەمە لایەنە، کە گشت پێداویستیەکان بگرێتەوە.

ج-تەرتیب کردنی خەرجیەکە بە گوێرەی لە پێش و لە پێشتری(الأولويات).

| | |
|---|---|
| ٣-ژمارەی تاکەکانی خێزان: | ١٠ |
| ا-ژمارەی منداڵان: | ٥ |
| ب-ژمارەی قوتابیەکان: | ٣ |
| ج-ژمارەی ئافرەتان: | ١ |
| د-ژمارەی پیاوان: | ١ |
| ٤-ماوەی زەمەنی بودجەکە: | ٣ مانگ |

٥-بڕی ئەو پارەیەی کە بۆ بودجەکە دەبڕدرێتەوە بریتیە لە (١٥,٠٠٠) دینار.

٦-رەگەزەکانی سەرفکردنی بودجەکە بەجۆرەیە:

ا-شتە زۆر پێویستەکان (زەروریات) کە رێژەکەی دەگاتە ٨٠٪ ی بودجەکە و بڕەکەی بریتیە لە ١٢٠٠٠ دینار، بەم جۆرە دابەش دەکرێ:

---

[١] بودجە: ميزانية

| جۆر | ڕێژەکەی | بڕەکەی (دینار) |
|---|---|---|
| خواردن | ٪٣٥ | ٥٦٢٥ |
| خواردنەوە | ٪٥ | ٧٥٠ |
| جلوبەرگ | ٪١٠ | ١٥٠٠ |
| چارەسەری | ٪٧ | ١٠٥٠ |
| کرێی خانو | ٪١٥ | ٢٢٥٠ |
| وزەی غاز و کارەبا | ٪٥ | ٧٥٠ |
| پێداویستیەکانی قوتابخانە | ٪٣ | ٤٥٠ |
| کۆ ژمار | ٪٨٠ | ١٢٠٠٠ |

ب-شتە کەمالیەکان کە ڕێژەکەی دەگاتــە ٢٠٪ی بودجەکـە و بڕەکـەی بریتیـە لـە ٣٠٠٠ دینار، بەمجۆرە دابەش دەکرێ:

| جۆر | ڕێژە | بڕ (دینار) |
|---|---|---|
| میوانداری | ٪٨ | ١٢٠٠ |
| دیاری | ٪٤ | ٦٠٠ |
| تەلەفۆن | ٪٤ | ٦٠٠ |
| کرێی گواستنەوە | ٪٤ | ٦٠٠ |
| کۆژمار | ٪٢٠ | ٣٠٠٠ |

٧-ئەو کەسەی بە پرۆسەی سەرفکردنی بودجەکە هەڵدەستێ: خانمی ماڵەوەیە.

٨-ئەو کەسەی کاری سەرپەرشتی و هەڵنرخاندن دەگرێتە ئەستۆ: پیاوی ماڵەوەیە.

٩-ماوەی پێداچونەوە و هەڵنرخاندن: پازدە ڕۆژ جارێك.

## تێبینیەکان لەسەر ئەم بودجەیە چین؟

یەکێك لە پلانی ئەم بودجەیە رامێنێ، کە داهاتەکەی ٥٠٠٠ دینارە لە مــانگێکدا، ئەوا چەند تێبینیەکی لە لادا دروست دەبێ:

ا-تەرخان نەکردنی بڕێك بۆ کارە خێرخوازیەکان.

ب-پاشەکەوت نەکردنی هیچ بڕێك بۆ حاڵەتە ناکاویەکان و پڕۆژە ئایندەییەکانی وەك کڕینی ترۆمبێلێك.

ج-تەرخان نەکردنی هیچ بڕێك بۆ کتێب و کاسێت و گۆڤـار و شـتی هاوشـێوە، کـە پەیوەندی بە لایەنی زانستی و رۆشنبیری و ژیانی خێزانەوە هەیە. لەسەر ئەم بنەمایانـە دەبێ چاوێك بە پلانەکەدا بخشێندرێتەوە، تا بەڵکو چەند برە پارەیەك لەهەر بـەندێك لـە بەندەکاندا گل درێتەوە، یا ئەوەتە دەبێ برە پارەیەکی تر دابین بکرێ، بۆ پـڕ کردنـەوەی ئەم چەند لایەنە.

## چاکترین بەکارهێنانی کات:

ترسناکترین گرفت کە ڕوبەڕوی نەتەوە و تاکەکان دەبێتەوە، بریتیە لە گرفتی کات بە فیڕۆدان، کە ئەمەش واتای بەفیڕۆدانی ژیان دەگەیەنێ.

ڕەنگە هەمو فەوتاوێك بگەڕێندرێتەوە، تەنها کاتە فەوتاوەکان نەبن، بۆیە هەمیشـە ئەم دەستەواژانە بەبیر خۆت بهێنەوە و بەخەتێکی گەورە بینوسەوە و لەبەر چاوت بێ:

(( کات لە دایك نابێتەوە، درێژ ناکرێتـەوە، ناوەسـتێنرێ، ناگەڕێندرێتـەوە، بـەڵکو هەمیشە ڕوە و پێشەوە دەڕوات )).

کە یەکەمین سەرکەوتن لە ژیاندا ئەوەیـە، کـە بـە شـێوەیەکی چالاکانـە کاتەکـەت بەڕێوە ببەی. خۆی لە ڕاستیدا کات ناکرێ لە لایەن مرۆڤەوە بەڕێوە ببرێ هەر چەندە لـە نوسراوەکاندا دەستەواژەی بەڕێوەبردنی کات زۆر بەفرەوانی بەکارهاتوە، چونکە کات بـە قەدەری خواوە بەڕێوە دەچێ و ئەوەی، کە لە توانای ئێمە دایە بەڕێوەی ببەین، بریتیە لە چاك بەکارهێنانی کاتەکە. قورئانی پیرۆز زۆر دوپاتی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە وریا بین لە کات بەفیڕۆ دان، هەروەها فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەم مەسەلەیە هاتمان دەدەن، زانا و کارزان و خاوەن ئەزمونەکانیش هەریەکە و بەشـبەحاڵی خۆیـان وریاییـان داوە.

## ئەم ڕەگەزانەی کە دەکرێ لە ژیاندا کاتیان بەسەردا دابەش بکرێ ئەمانەن:

١-هەرە پێویستەکان (زەروریات)، کە ئەمانەن: (بەجێگەیاندنی فەرزەکان، خواردن، خواردنەوە، نوستن، چارەسەرکردن، جوتبون لەگەڵ خێزاندا).

٢-پەیوەندییەکان، کــە لەگــەڵ ئەمانــەدا دەبەســترێن: (خــزم و نزیکــان، بــرادەران، ھ‌ەوڕێیان، دراوسێکان).

٣-پەرەبــەخۆپێدان و گەشــتوگوزار، کــە ئەمانــەن: (نوســین و خوێندنــەوە، وەرزش، سەیران، سوننەتەکانی عیبادەت).

٤-حاڵەتە لە پڕ و ناکاویەکان، کە ئەمانەن: (بۆنەکان، رووداوەکان، قەیرانەکان).

٥-کاری تایبەتکراو بۆ رزق پەیداکردن، جا فەرمانبەرایەتی بێ، یان بازرگــانی، یــان کشتوکاڵی، یان ھەر پیشەیەك بێ، جا کاتە تەرخانکراوەکانیش، یا ئەوەتــە بەرھــەمدار دەبێ یان فەوتاو.

ھەریەك لەم بڕگانە وردەکاری خۆی ھەیە، بەڵام ئێرە جێی باسکردنیان نیە، ئەگەرچی بۆ ھەر بەشێك لەمانە چەند ئاماژەیەك دەخەینە بەرچاو:

١-پێداویستیەکانت لە یەك شوێن و لە ھەمان کات و بــەھێندێکی زۆر بکــڕە و زوو زوو نەچیتەوە ھەمان شت بکــڕی. قوتابخانــە و چارەســەری و ســەیرانەکانیش ھــەر بــەم شێوەیە.

٢-سەبارەت بەکاری فەرمانبەرێتی بۆ ئەم بەشانەی دابەش بکە و ھــەوڵدە تــا پێــت دەکرێ ئەم بەشانە بپارێزی:

ا-بەشی یەکەم بۆ دیــداری بەرفــەرمان و ســەرۆکەکانت بــێ بــۆ ئــەوەی لــە بــارەی مەســەلەکانی کارەکەدا وتووێژیان لەگەڵ ئەنجام بدەی.

ب-بەشی دوەم بۆ دیداری ئەو کەسانە بێ کە سەردانی نوسینگەکەت دەکەن و گــوێ بگریە داخوازیەکانیان.

ج-بەشی سێیەم بۆ راپەڕاندنی ئەو موعامەلات و لاپەڕانە بــێ، کــە پێویســتە لــەو رۆژیدا جێبەجێیان بکەی.

د-بەشی چوارەم بۆ وەڵامدانەوەی پەیوەندیە تەلەفۆنیەکان بێت، کە بــۆ نوســینگەت کراون. لەیادت نەچێ تەلەفۆن ئامرازێکە بۆ جێبەجێ کردنی کارەکان دانراوە، بۆیە ھــەر ئەوەندەی پێویستە بەکاری بێنە و مەیکە بە ئامرازی کات کوشتن.

٣-سەبارەت بە سەردانەکانت کە تۆ دەیکــەی، یــان کــە خــەڵك دێنــە لات ھــەوڵدە بەگوێرەی مەوعیدی پێشینە بن و بەقەدەر پێویستی بن، ھەروەھا کاتەکــەش لــە شــتی بەسود بەرێ بکەی و لە پەراوێزەکانی کاتەکەشدا چەند کارێکی لاوەکی ئەنجام بدەی.

٤-سەبارەت بە گواستنەوە لە شوێنێ بۆ شوێنێکی تر، با بەهۆی ئەو ئامرازانەوە بن، کە زۆرتر کات و پارە و ماندوبونت بۆ دەگەڕێننەوە، شتێکی چاکە ئەگەر بتوانی کات و ڕێگای وا هەڵبژێری، کە قەرەباڵغ نەبن. ئەگەر توانیت لەو کاتەی کە بەفڕۆکە، یان بە پاس، یان بە شەمەندەفەر سەفەر دەکەی، کاتەکەی بقۆزیەوە و چەند کارێ ئەنجام بدەی، ئەوا شتێکی چاکە، یان هەرنا ئیسراحەت بکە و سەرخەوێ بشکێنە، تا بتوانی ئامادەبونەوەیەك وەرگریەوە بۆ ئەنجامدانی کارەکانت دوای ئەوەی دەگەیتە جێ. هەوڵ دە ماوەیەك بەر لەکاتی سەفەرکردنەکەت تیکێت[1] ببڕیت و شوێن داگیر بکەی بەتایبەتی لە وەرزەکاندا.

٥-کاتە ناچارییەکانی چاوەڕوانی، وەکو چاوەڕوانکردن لە ترافیك لایتەکان، یان لە سەردانگەی دکتۆران، یان تا میوانێکت دێت، یان گەر میوان بیت تا چێشت ئامادە دەبێ... ئەمجۆرە چاوەڕوانیانە گەلێ کاتی تێدا بەفیڕۆ دەڕوات.

## جا بۆ ئەوەی ئەم گرفتانە وەلاوە نێی ئەم شتانە بکە:

هەوڵدە مەوعیدەکانت ڕێك بخەی تا ماوەی چاوەڕوانیت کەم بێتەوە، بە مەوعیدەکانت پابەندبە و کاتی وایان بۆ هەڵبژێرە زەحمەتی کەم بێ، کورتترین و چۆڵترین ڕێگا بگرە بەر و ڕێشنایی کەسانی تریش بکە، کە هەر کەسە و بە ڕۆڵی خۆی هەڵسێ و سنور نەبەزێنێ، دوایین جار سود لە چاوەڕوانیەکانت وەرگرە و هەوڵدە شتێ بخوێنیەوە، یان بنوسی، یان بیربکەیەوە، یان یادی خوا بکەی.

٦-چەند کاتێکی تایبەتی لە بەرنامەکەت دیاری بکە، تا لەمیانەی خوێندنەوە و خوێندن و بەشداربون لە خولە تایبەتیە گونجاوەکان و ئیعتکاف کردن بۆ عیبادەت و گرتنی ڕۆژە سوننەتەکان و هاوشێوەی ئەمانە؛ پەرە بەخۆت بدەیت.

٧-چەند کاتێکی بەرنامەکەت بۆ ئەنجامدانی گەشت و گوزار و سەیرانی ڕێپێدراو و نا حەرام تەرخان بکەی. مەڵێ ئەم جۆرە کارانە کات بەفیڕۆ دەدەن، چونکە ئەگەر بە جوانی سودیان لێ وەربگیرێ و زێدە ڕۆییان تێدا نەبێ و لەکاتی گونجاوی خۆیان بن، ئەوا

[1] تیکێت: بلیت

جوانترین کاریگەری لەســـەر وەجموجۆڵخســـتنەوەی دەرون دروســـت دەکـەن و، بـێزاری و هەراسانی و شەکەتیەکان ناهێڵن.

٨-دوو دڵ مەبە لە بەکارهێنانی دەستەواژەی (إرجعوا هُوَ أزکـی لَکُـم: بگەڕێنـەوە، ئەمە مایەی پاکییە بۆتان)، هەروەها لە بەکارهێنانی وشەی (نەخێر) بـۆ ئـەو بێکـار و دەسبەتاڵانەی کە ڕوت لێ دەنێن و کاتت لێ بەفیڕۆ دەدەن، کە بەنرخترین شتە لە ژیان.

٩-وریابە ژیانی خۆت لەبەردەم ئامڕازەکانی رابواردن بەفیڕۆ مەدە و خـۆت کۆنـترۆڵ بکە.

تەنانەت منداڵەکانیشت وا ڕابێنە ڕێزی ڕێکخستن بگرن و ژیانیان ڕێکو پێك بکەن و کاتەکانیان بە فیڕۆ نەدەن و لە شتی چاك بەسەری ببەن و هەسـت بە ڕوحـی لێپرسـینەوە بکەن.

١٠-سندوقێکی بچوك تەرخان بکە بۆ کلیلە یەدەگەکانت و لە شوێنێکی وای دابنـێ بە ئاسانی دەستت بیگاتێ و دوور بێ لە دەستی منـاڵ و فزوڵییـەکان[1]. ئـەو کلیلانـەی لەگەڵ خۆتیشی هەڵدەگری هەمیشە لەیەك شوێن دایاننێ تا لە هەمو بارودۆخێکدا هەر کە دەستت بۆ بردن بتوانی بیانهێنیە دەرەوە. هەمو کلیلەکان لەیەك مەدالیا کۆمەکەوە بەڵکو هەر کۆمەڵە کلیلێکی هاوچەشنە لە مەدالیایەك کۆ بکەوە. مەسـەلەی شـێوازی هەڵگرتنی کلیل بۆیە گرنگە، چونکە گەلێ جار کاتێکی زۆر بـە دۆزینـەوەی کلیلـەکان بەفیڕۆ دەڕوات و ڕەنگە جار هەبێ دەرگاکانیش بشـکێندرێن، یـان کارەکـانیش پـەکیان بکەوێ.

## چۆن کات بەفیڕۆدان کەم دەکەیتەوە؟

١-ڕۆژێ چەند کاتت بەفیڕۆ دەدەی لە دەفتەرێکی بچوکدا بینوسە، بۆ مـاوەی یـەك هەفتە، پاشان بۆ ماوەی مانگێك، پاشان بۆ مـاوەی سـاڵێك بـەردەوام بـە و سـەرەنجام هەمو کاتە بەفیڕۆدراوەکانی ساڵەکە کۆ بکەوە و حیسابیان بکە، بزانـە چ ڕێژەیـەك لـە ژیانت بەفیڕۆ چوە.

---

١ ئەو کەسانەن کە هەر بۆ خۆشی دەست لە شتان یان خۆیان لە بابەتان هەڵدەقورتێنن، ئەو سیفەتە لییان بوەتە عادەت. وەرگێر.

ئەم ڕوپەڕەی کە کاتە بەفیڕۆچوەکانی تێدا دەنوسی دەکرێ بەم خشتەیە بێ:

| مێژو | بڕی کاتی بەفیڕۆچو | هۆیەکەی | شوێنەکەی | لەگەڵ کێ |
|---|---|---|---|---|
| | | | | |
| | | | | |
| | | | | |

٢-کاتەکانت واقیعیانە بەسەر کارەکانت دابەش بکە، پاشان بڕوانە کام کار زۆرترین ئاتاجی هەیە و کامیش کاتی پتری دراوەتێ، یان کەمتری دراوەتێ، ئینجا بەپێی ئەنجامەکانی ئەم پێداچونەوەیە، هاوسەنگی بەرنامەکەت بگەڕێنەوە.

٣-لەکاتی هێمنی و خۆخاوکردنەوە (استرخاء)دا مەیلەکانی دەرونت بناسە و کاریگەریەکانیشیان لەبەرچاو بگرە، لە کاروبارە کەم بایەخ و بێ نرخەکاندا تا چەند دەبنە مایەی کات بەفیڕۆدان. تا بتوانی ڕاستەڕێیان بکەیتەوە و لەگەڵ دەرونەکەتدا کرد و کۆش بکەی.

* * *

## خۆکۆنترۆڵکردن[1] و بڕوابەخۆبون:

هۆکارە کاریگەرەکان لەسەر کەسایەتیت:

**١-هۆکارە خۆییەکان:** کە گەورەترین کاریگەریان لەسەر کەسایەتی هەیە و باشترین وەڵامدانەوەشیان بۆ ئەو هەوڵانەی مرۆڤ هەیە، کە لە پێناو پەرەپێدان و ڕاستەرێکردنەوە و باڵابون، یان لە پێناو داڕوخان و ڕونشێوی تەرخان دەکرێن. هەندێك لەم هۆکارانە بریتین لە:

بیروباوەڕ و ئاین، ڕۆشنبیری و زانیاری، ڕەوشت و هەڵسوکەوت، کارامەیی و ئەزمون، دروستیی جەستەیی و دەرونی، دیمەنی دەرەوەیی، ڕێکخستنی ژیان، هیوایەتەکان، ئاوات و هیوا ئایندەییەکان.

---

١ خۆکۆنترۆڵکردن: سیطرة

**٢-هۆکاره مادديه دەرەكيەكان**، وەکو: پاره و پـول، ترۆمبێـل، خـانو، كتێبخانـه، خواردن، وەرزش، پيشه و فەرمانبەرێتی.

**٣-هۆکاره مرۆييەکان**: مەبەسـت لـەو پەيوەنديانـە دێ، کـە لەگـەڵ کەسـانی تـر دەبەسترێن وەکو خێزان و هێتيمەکان، هەروەها ئەو پەيوەنديانـەش، کـە لەگـەڵ خـزم و دۆست و برادەر و هاوکار و دراوسێ و شوێنە کۆمەڵايەتيەکان گرێ دەدرێ، هەمديسـان ئەو پەيوەنديه لابەلايانەش، كە لە گەشت و بازاڕ و شتی ترەوە پەيدا دەبن.

**٤-رووداو و کارەساتەکان**، وەکو: نەخۆشـی، رووداوەکـانی ترۆمبێـل، هـەرا و هۆريـا کۆمەڵايەتيەکان، جەنگە سەربازيەکان، کارەساتە ئابوريەکان، پێشـهاتە سروشتيەکانی وەك بومە لەرزە و لافاوەکان.

جا ئەم پێشهاتانە يـا ئەوەتـە ئـازار بـەخش و جـەرگبڕن يـانيش ئاسـودە بـەخش و دڵخۆشکەرن.

هەروەها رەنگە دەستنەنقەست بن، يان بێدەستی کەس بن.

کاريگەری هەريەك لەم هۆکارانە لەسەر دەرون و کەسايەتی، يا ئەوەتە بەشـێوەيەکی پۆزەتيڤانەيە، يا بەشێوەيەکی نێگەتيڤانەيە. مرۆڤ دەتوانێ فۆرمێك بـۆ شـيکردنەوەی کەسايەتی خۆی دروست بکات و گشت ئـەم هۆکارانـەی تێـدا بنوسـێ، پاشـان لـەخۆی بڕوانێ چ لايەنێکی پۆزەتيڤ و نێگەتيڤانەی لەهـەر هۆکـارێك لـە هۆکارەکـان تێدايـە تۆماری بکات و، لە کۆتاييدا سەرجەم لايەنـە پۆزەتيـڤ و نێگەتيڤـەکان هـەڵژمێرێ و خاڵە لاواز و بەهێزەکانی کەسايەتی خۆی دەستنيشان بکات.

لە ڕاستيدا من زۆر بە کورتی لە بارەی ئەم مەسـەلەيەوە دەدوێـم و هـەر ويسـتومە ئاماژەی پێ بدەم.

* * *

# خۆبەڕێوەبردن

هەڵبەت وەدەستهێنانی سەرکەوتن لە خۆبەڕێوەبردن و ڕەفتـار لەگـەڵ خۆگرتندا بـە چوست و چالاکی بریتیە، لە یەکەمین ڕێگەی سـەرکەوتن لـە ژیـاندا. ناسـەرکەوتویش لەگەڵ خۆدا زۆربەی جاران دەبێتە مایەی ناسەرکەوتویی لە سەرجەمی ژیاندا، تەنانـەت -خوا پەنامان بدا- ڕەنگە ببێتە مایەی سەرنەکەوتویی لە دوارۆژیشدا.

خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ: هەر نەتەوەیەك تا خۆیان نەگۆڕن خوا نایانگۆڕێ. ﴾الرعد/١١.

گۆڕانیش لەوانەیە پۆزەتیڤانە بێ بەرەو باشتر، لەوانەشە نێگەتیڤانە بێ بەرەو خراپتر.

خەڵك هەیە وا دێنە بەرچاومان کە لە ژیاندا سـەرکەوتنیان وەدەسـت هێنابـێ هـەر چەندە لە خۆبەڕێوەبردنیشـدا نـا سـەرکەوتو بونـە، بـەڵام ئەمـە لـە ڕاسـتیەوە دورە و خەیاڵێکی خەڵەتێنەر و ڕوپۆشێکی ڕواڵەتیە و هـەر لەگـەڵ یەکـەمین ڕاهـەژاندا هـەمو بەدبەختی و کلۆڵیەکیانی وەدەردەکەون.

دەبا ئەو سەرکەوتنە درۆینەیە هەر هەڵوەرێ کە لە ناخی خاوەنەکەیدایە، ئەو کەسـە چ بەدبەختێکە کە واپیشان دەدا سـەرکەوتنی بەدەسـت هێنـاوە، کـەچی لـە ناخـەوەش جۆرەها بەدبەختی و کلۆڵی و ناسودەیی لەخۆ بارکردوە، ئەگەر چی خۆشترین و جوانترین ترومبێلیش باژوات و پایەی بەرز و سامانی زۆر و زەوەندیشی هەبێ.

خوێنەری بەڕێز بفەرمو لەگەڵ چەند یاسایەکی گشتی، کە ئەگەر مـرۆڤ لـە ژیـاندا پراکتیزەیان بکات، ئەوا بە یارمەتی خواوە دەتوانێ بە چوست و چالاکیەوە خۆی بـەڕێوە ببات:

١-مافەکانی خوای باڵا دەست بەجێ بگەیەنە و لە هـەر کاروبـارێکی دێتـە پێشـت پشت بەخوا ببەستە بەو جۆرەی کە لە نوێژدا بەڵێن دەدەی و دەڵێی: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّـاكَ نَسْتَعِينُ: هەر تۆ دەپەرستین و هەر پشـت بـەتۆش دەبەسـتین.﴾. چونکـە مـرۆڤ ئەگـەر نێوانی خۆی و خوای چاك سازاند، خواش کاروبارەکانی ژیانی چاك دەسازێنێ. هـەروەها ئەگەر لە کاتی خۆشیدا خوای ناسی و لە بیری بـو، ئـەوا خـواش لـە کـاتی تەنگانـەدا بەهانایەوە دێت، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ((إحفظ الله يحفظـك: خـوا بپـارێزە

دەتپارێزێ )). ئەو کەسەش کە مافەکانی خوا پشت گوێ دەخات ئەوا مافەکانی تر هەر بەفیڕۆ دەدات: ﴿ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ﴾.

ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کە گوتویەتی: ( دڵ پەرگەندەبونێکی وای هەیە، کە تەنـها بە ڕوو لە خوا کردن دەگیرسێتەوە، هەست بە جۆرە تەنیا بونێکی وا دەکا، کە تەنها بـە ئاشنایی خوا دەتارێ، خەمێکی وای هەیە، کە تەنها بەهۆی دڵخۆشبون بە ناسینی خـوا و ڕاستەڕێبونەوە دەڕەوێتەوە، دودڵی‌یەکی وای هەیە، کە تەنها بە بەرەو لای خوا چونەوە ئارام دەگرێتەوە، ئاتاجبونێکی وای هەیە، کە تەنها خۆشەویستی خـوا و ژیوانبونـەوە و هەمیشە یاد کردن و دڵسۆزبون بۆ خوا پڕی دەکاتەوە و هیچ شتێکی تر تەنانەت هەرچی لە دنیا و لە ناویدا هەیە پڕی ناکاتەوە).

تۆ لەگەڵ خوا بە خواش لەگەڵتە و ڕەنجت بەهەدەر نادا.

٢-هەمیشـە گەشـبین بـە و چـاوەڕێی سـەرکەوتن بـە بـەئیزنی خـوا،بـا هەمیشـە موژدەبەخشـی بەسـەر بیرکردنـەوە و هەسـتت زاڵ بێـت، پێغەمبـەر ﷺ فەرمویـــەتی: ((بَشِروا وَلا تنفروا: موژدە ببەخشن و خەڵك مەڕەوێننەوە)).

٣-خۆت وا رابێنە ئامانجەکانی هەر کارێکی کە دەیکەی، بـــەرز و پـیرۆز و ڕون بـن هەروەکو لە پێشودا باسمان لێوە کردوە.

٤-لە کاروبارە جیاوازەکانی ژیانتدا خۆت بە پلان دانان پابەند بکە و، تا پێت دەکرێ لە بێسەروبەری و سەرپێکاری دور بە. هەوڵەکانت ڕێك بخـە و ڕو لـە ئامـانجێکی ڕونـی دیـاریکراو بکـە و وریابـە بێسـەروبەری نەکەوێتـە نێـو هــەنگاوەکانی وەدیـــهێنانی ئامانجەکەت. پێشتر باسمان لە پلان دانانەوە کردوە.

٥-ئەو پلانانەی بۆ وەدەستهێنانی ئامانجەکان دایاندەڕێژی لەچەند کردەوەیەکی ڕون و ئاشکرا و زندودا بەرجەستەیان بکە و، خۆت لە بێکاری و پاشاخوازی بپارێزە، دواتر بـە ویستی خوا بەدرێژتر باسی لێوە دەکەین.

٦-وریابە هیچ بەشە کاتێك بە بێکاری بەفیڕۆ نەدەی، چونکە کـات بـەفیڕۆدان واتـا ژیان بەفیڕۆدان. هەوڵدە ڕۆژ بە ڕۆژ پتر بەرەو ئامانجەکانت بچیتە پێشەوە، ئەگەر چی بە هەنگاوێکیش بێ، چونکە ئەو کەسەی ڕێ دەگرێتە بەر، دەگاتە جێی مەبەست. بەر لـــە کەمێك لە بارەی ئەوەوە دواین، کە چۆن بە چاکترین شێوە کاتەکانمان بەکاربێنین.

٧-کاروبارەکانت بەو جۆرە رێك بخە، کە گشت مەوعید و پابەندییەکانت بنوسە و خۆت وارابێنە نوسینەکەشت لەلادا بێ، هەروەها بەشێوەیەکی وا شت و مەك و کتێبخانە و ترومبێل و شتەکانی ترت رێك بخە، کە بتوانی بە ئاسانی مەبەستەکانت بێننە دی. هەروەك پێشتر لە جێباسی (رێکخستنی ژیان مەرجێکی سەرکەوتنە) باسمان لێوە کردوە.

٨-خۆ راگربە بەرامبەر ئەو هەوڵە دەرونیانەی، کە وات لێدەکات لە کارە گرنگ و تۆکمەکان هەڵبێیت و روبکەیتە چێژ و خۆشی و بێئاگاییەکی بەردەوام. بە ویستی خوا دواتر پتری لێوە باس دەکەین.

٩-لەبیرت نەچێ کردەوەکان زۆرترن لە کاتەکان. کەواتە وریابە، نەکەی کاتەکانت لە کارە کەم بایەخ و بێنرخەکان بەفیڕۆ بدەی، بەڵکو کارە گرنگەکان وەپێش بخە و خۆت بەوانەوە خەریك بکە.

١٠-با دروشمت بریتی بێ لە دەستپێشخەریکردن و خێرا ئەنجامدانی هەر کارێکی خێر، گەر هەبێ، چونکە ئەو شتی رۆیشت گەڕانەوەی بۆ نیە، ژیانیش پێشبڕکێیە و لەوە کورتترە، کە تۆ چاوەڕێ بیت، یان دوای بخەی، یان بڵێی پاشان فلان شت دەکەم.

١١-ئەگەر نەریتێکی خراپ، یان رێگرێکی وا هەبو و دەبوە کۆسپ و تەگەرەی سەر رێی پێشکەوتنت بەرەو ئامانجەکان، ئەوا هەر زوو بیانگۆڕە و هەوڵدە نەریتی چاك و هاندەر لەخۆت بێنەدی.

با هیچ نەریتێك دەسەڵاتی بەسەرتا نەشکێ، مەگەر بەو ئەندازەیە، کە سودێك، یان هەقێکت بۆ دابین بکات.

نەریت بریتیە لەو کارانەی کە مرۆڤ بە شێوەیەکی تۆماتیکی دوبارە و سێبارەیان دەکاتەوە، بێئەوەی هیچ کۆششێکی هزری، یان ئەزیەتێکی جەستەیی هەبێ. نەریتەکان شتێکی وەدەست هاتون، بۆیە دەکرێ لەکاتی پێویستدا بگۆڕدرێن و نەریتی تر جێیان بگرنەوە، هەر چەندە زەحمەتیشی تێدایە، بەڵام ئەو کەسەی دەرونەکەی لەسەر کردەی خێر و کار و بەرهەمهێنان راهێنابێ، پێی زەحمەت نیە و نیتر لەسەر ئەوە رادێ، بەڵام ئەو کەسەی دەرونەکەی خۆی لەسەر کاری بەد و خراپەکاری راهێنابێ ئەوا دەقی پێوە دەگرێ.

۱۲-بەها و پرەنسیپە باوەڕییەکان لەسەروی موساوەماتەکان دانێ و پرەنسیپەکان سەرتاپای چالاکیەکانی ژیانت ئاراستە بکەن، ئەگەر -پەنا بەخوا- تۆ وانەبوی، ئەوا تۆ یەکەم کەسی کە خۆت لەبەرچاو سوك ببێ، ئەگەر چی خەڵکیش بەگەورەت بگرن و پێتدا هەڵبڵێن.

۱۳-هەمیشە وەدوای ڕەوا و ڕاستی بکەوە و، خۆت لە هەمو جۆرە شێوەکانی دورویی بپارێزە، بەو پەڕی ڕێز و دەمپاکی و ڕاستگۆییەوە هەق دەربڕە و گەشە بە توانای دەرونت بدە، تا لە دوریانی هەق و ناهەقدا بتوانی خۆت یەکلا بکەیەوە و هەق هەڵبژێری.

۱٤-بە ئازایی و ئارامگرتن و خۆڕاگری و بەرپرسیەوە، ڕوبەڕوی ئەنجامی کارەکانت ببەوە و بزانە هەر بەڵایەکت بێتە پێش لەلای خواوە پاداشت دەکرێی. لاشت ڕون بێ ئەو شتی، کە بەسەرت هاتوە هەموی لە لای خوا نوسراوە و بڕاوەتەوە و هەرگیز بۆی نەبوو بەسەرت نەیەت. وریابە لەوەی زۆر سکاڵا و بێزاری دەربڕی، چونکە ئەمە سیفەتی لاوازەکانە (خراپترین سیفەت لەپیاودا ئەوەیە کە ڕەزیلەیەکی ترسنۆکانە و ترسێکی ئەژنۆ شکێنەرانەی هەبێ). ﴿ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ: بێگومان ئارامگرەکان لەلای خواوە پاداشتی بێ ژمارەی خۆیان وەردەگرنەوە﴾.

۱٥-کەسایەتی خۆت وەك شوشەی سپی لێ مەکە، هەمو کەس دیوی ناوەوە و هەقیقەتەکەی ببینێ. هەر ڕێبوارە و ڕێیەکی خۆی هەیە. ژیان مرۆی لامێژ و پرسەڵۆك[1] بەڵکو بەدخوازانی زۆر تێدایە، بۆیە تۆ دەبێ دەرگایەکی قایم و مەحکەم و پاسەوانێکی دڵسۆزی وا دابنێی، کە تەنها بەفەرمانی تۆ و لە کاتی گونجاو و بە ئەندازەی پێویست و تەنها بۆ کەسانی شایستە دەرگاکە بکاتەوە، کە پێویستیش بوو دایخاتەوە.

ئەم کارە وات لێ دەخوازێ مەشقی لەسەر بکەی و خۆت رابێنی لەسەر کۆنترۆڵکردنی هەست و ئیحساسەکانت، ئەگەر بەرژەوەندی تێدا نەبێ وەدەریان نەخەی، هەروەها لە ڕەوشی جددی و وروژێنەردا هێمنی خۆت بپارێزی و توڕەییت دامرکێنیەوە و وشەکانت بە چاودێریەوە هەڵبژێری. بەکورتی با دەستەواژەکانی گڕ و کڵپەی سۆزت بەبیرلێکردنەوە و تاوتوێکردن بن.

---

۱ لامێژ: طفیلی. پرسەڵۆك: فضولی.

١٦-با پێشەنگ و وێنەی هەرە بەرزی هەمیشەییت محمد ﷺبێ، چونکە ئەو گەیشتۆتە ئەوپەڕی پلەی کەمالی مرۆڤانی و چارەی هەر گرفتێکیشت گەرەك بێ هەڵبەت لە ڕێژینە[1] پیرۆزەکەیدا دەیدۆزیەوە، ئەمەش وات لێ دەخوازێ کە هەردەم ڕێژینەکەی بخوێنیەوە و ڕێوشوێنەکەی بتوێژیەوە.

١٧-هەمیشە تەنزئامێز و ڕوخۆش بە، بەڵام بێنەوەی بگاتە ڕاددەی خۆ سوك کردن و زێدەڕۆیی.

هەرکاتێکیش ناخۆشیەکانت هەر چەندی توندتر یەخەیان گرتی، تۆ هەر بە زەردەخەنەوە روبەرویان ببەوە، چونکە خەم و شت لەخۆ گەورەکردن، دەرون دەفەوتێنن و جەستە شەکەت و هزریش شپرزە دەکەن.

١٨-خۆت لەو خەیاڵە بەرەڵڵایە بپارێزە، کە لە ئاسمانی وەهمەکانەوە هەڵدەفڕێ، هەروەها لەو ڕەشبینیەش وریابە، کە ئاواتەکانت تەفر و تونا دەکات. لە نێو هەردوکیاندا بارێکی مامناوەندی وەرگرە و خەیاڵ و واقع تێکەڵ بەیەك بکە.

جمینە(نزوات) سۆزئامێزەکانت بە دیدەی عەقڵ کۆنترۆڵ بکە و تیشکی عەقڵیش بە کڵپەی سۆز بەتین و تاو و شەوقدار بکە. خەیاڵی خۆت وابەستەی هەقیقەت و واقیعی ڕاست بکە و هەقیقەتەکان لەبەر ڕۆشنایی خەیاڵی گەش و بریقەدار دا بدۆزەوە.

١٩-هێندە بەشتە کەمالیەکان ڕۆ مەچۆ؛ لە شتە کەم بایەخ و بێنرخەکان بفەوتێی. بەڵکو هەرهێندە بەخۆشی و چێژەکانەوە خەریك بە، تا بە ئامانجەکانت دەگەیەنێ و بارت قورس ناکات (هێندە بەناز و گۆزەوە مەژین، چونکە نیعمەتەکان هەمیشەیی نین). ئەو کەسەی ببێتە دیلی چێژ و ئارەزوەکان، زۆری لەبەر زەحمەت دەبێ دەسبەرداریان بێ و ئیرادەکەشی زۆر لاواز و ناسك دەبێ.

٢٠-لە کۆتاییدا بزانە کە هەمو مرۆڤێ سیفەتی لاواز و سیفەتی بەهێزی هەیە و، خۆیشی لە هەمو کەس چاکتر پێیان ئاشنایە، ئەگەر لوتبەرزی نەنوێنێ، یان خۆی لێ نەبان نەکات. مرۆی ژیر ئەو کەسەیە کە ژیان و کار و تایبەتمەندیەکەی خۆی، بەهۆی سیفەتە بەهێزەکانیەوە ئاراستە دەکات و کەسێتی خۆی و ژیانەکەشی لە خاڵە لاوازەکان دوردەخاتەوە.

---

[1] ڕیژین: سیرة

ئای چەند زۆرن ئەو گەوهەرانەی کە بەجوانترین و درەوشاوەترین تیشکەکانیان چاوان تاو دەدەن و لە قولایی تاریکی زەریاکاندا نشیون. ئای چەند زۆرن ئەو گولانـەی کـە لـە بیاباندا لەسەر لاسکی دلڕفێنی خۆیان وەستاون و بۆن و بەرامەیان لەگەڵ گەرد و تـۆزی لمستاندا بەفیڕۆ دەڕوات.. هەڵبەت ئەگەر ئەم گوڵ و گەوهەرانـە بدۆزیتـەوە رەوشـی تـر دێننە ئاراوە.

## چۆن بەسەر دەرونەکەت زاڵ دەبی؟

هیچ شتێ لەوە قورستر و ئەستەمتر نیە، کە مـرۆڤ لەگـەڵ دەرونـی خـۆی کۆشـش بکات و هەوڵ بدا ئاکار و مۆرکە ناپەسندەکانی بگۆڕێت و ڕەوشتە جوان و نەریتە چـاك و رەفتارە پەسندەکانی لێ بێنێتە دی. خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَـأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ: کەسانێك خۆ لە رژدی دەپارێزن، ئەوانە رزگارەکانن.﴾الحشر/٩.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((**ليس الشديد بالصرعة إنما الشديد من يملك نفسه عند الغضب**: ئازایەتی بە زۆرانبازی نیە، بەڵکو ئەو کەس ئازایە، کە لە کاتی تورەییدا خۆی کۆنترۆڵ بکات)).

شاعیرێکیش دەڵێ:

لولا المشقة ساد الناس كلهمو		الجود يفقر والإقدام قتّال

لە پشت هەمو رەفتـارە کەسـانییەکان و سـتایلە[1] ڕەوشـتییەکاندا تایبەتمەندییـەکی دەرونی هەیە، کە ڕێکیان دەخات و پاڵنەریانە.

بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێ بەسەر رەفتارەکانی زاڵ بێـت و ڕەوشـتەکانی بـەرەو بـەرزی هەڵنێ و هەڵسوکەوتەکانی کۆنترۆڵ بکات، ئەوا پێویستە لە سەرەتادا ئاوڕ لە پاڵنـەر و تایبەتمەندییە دەرونیەکانی بداتەوە و هـەرکامێکیان بوینـە مایـەی رەفتـاری چـەوت و رەوشتی نابەدڵ پاکیان بکاتەوە، یان قەڵەمیان بکات، یان هەڵیانکێشێ، یـان لـەناویان بەرێ.

هەرکامێکیشیان مایەی ڕەوشتی نەجیمزادەیی و رەفتاری ڕاستەڕێ و ڕێك و ڕەوانن، هەوڵدا بەهێزیان بکات و پەرەیان پێ بدات، ئەگەر ئەم جۆرە پاڵنەر و تایبەتمەندیانەشـی

---

١ ستایل: نمط، نەشم، چەشن.

نەبو، با بیانهێنێتــەدی. هەڵبــەت ئــەم پرۆســەیە کــارێکی قــورس و ئەســتەم و رەنگــە بەئازاریش بێ، چونکە هەرەشەکردن و گۆڕینی واقیعێکی دەرونی و ڕەفتاری و ڕەوشتیە.

دەرونیش لەمەڕ هەر گۆڕانێك، یان هەر هەڕەشەیەك لە واقیعەکەی بــەرگری لــەخۆی دەکات، جا واقیعەکەی هەرچۆنێ بێت، چونکە ئەو واقیعەی بۆی وەدیهاتوە بە کۆمەڵێك لەخۆڕازیبونی بیروباوەڕی، یان هزری، یان کۆمەڵێك چێژ و خۆشی دڵی، یان جەســتەیی، یان بە کۆمەڵێك باو و نەریتی چەسپاوەوە پەیوەستە.

کەواتە سەرەتای گۆڕانکاری لەو بنچینانەوە دەست پێ دەکات، کــە ئــەم ڕەوشــت و ڕەفتارانەی لەسەر بنیات نراوە.

بەهۆی پرۆڤــە و کۆششــکردن و پێداگرتــن و گۆڕینــی خۆڕازیکردنــە عەقلییــەکان و هەوڵدانی بەردەوامەوە، دەرون بەنەرمی ڕاپێچ دەکرێ و جڵەو بەدەستەوە دەدا، ئەو کاتە بەئاسانی و بە بەردەوامی کۆنترۆڵ و ئاڕاستە دەکرێ.

یەك لە خواناسان دەڵێ: دەرونم هەر دەگریا و منیــش هــەر بــەرەو لای خــوا ڕاپێچــم دەکرد تا گەیشتە ڕاددەیەك، کە بە پێکەنینەوە بەرەو لای خوا دەڕۆیشت.

هەمیشە خۆت چاودێری دەرونت بە و بەردەوام لێپرسینەوە لەگــەڵ هــزر و نــەریت و ڕەفتار و ڕەوشت و جوڵە و وشەکانت بکە، (لێپرسینەوە لەگەڵ خــۆ بکــەن، بــەر لــەوەی لێپرسینەوەتان لەگەڵدا بکرێ، کار و کردەوەکانی خۆتان بکێشن بەر لەوەی بکێشــرێن). ئەمانەی خوارەوەش چەند وێنەیەکن، کە دەرون تێیاندا بەرهەڵدا دەبێ و لەژێر کۆنــترۆڵ دەردەچێ، بۆیە پێویستە خۆتیان لێ بپارێزی.

## هەندێ شێوەی بەرهەڵدابون و لە کۆنترۆڵ دەرچونی دەرون:

هۆی گشت بەدبەختی و بەڵایــەك ئەوەیــە، کــە دەرون بەرهــەڵدا بــێ و لــە کۆنــترۆڵ دەرچێ، تا ئەوکاتەی هەوەست بەسەر عەقل زاڵ دەبێ. ئــەم بەرهەڵدابونــە زۆر شــێوەی هەیە بەڵام من لێرەدا چەند شێوەکیان لێ دەخەمە ڕوو، تا بتوانــی خۆتــی لێ بپــارێزی، پاشان ئەوە ڕون دەکەمەوە، چۆن بتوانین ڕوبەڕویان ببینەوە:

١-دواخستنی جێبەجێکردنی ئەو کارانەی، کە پێویستن زوو ئەنجام بدرێــن، ئەمــەش لەو پێناوەی کە ئیسراحەت و سرەوتنێك وەدەست بێنێ و ماندو نەبێ.

٢-دودڵی و شڵەژان لەو کاتەی هەوڵ دەدا کاریێ بکات، ئەمەش لەبەر ئەو ترسەی ...: فەشەل بێنێ، یان پێشبینی ناکات سەرکەوتنێکی سەد لە سەد بێنێ.
٣-بەرگەنەگرتنی ڕەخنە و تووڕە بون، بەهۆی شتی زۆر بێنرخ و کەم بایەخەوە، ئەگەر ...ش بێ هەمو شتێ تێکوپێك دەدات و ڕەچاوی سەرەنجامی توڕەبونەکەی، یان ...ب بۆ هیچ زەرەرێك ناکات.
٤-پەرت و بڵاوی زەین و خەست نەکردنەوەی هزر لە کاتی کارکردندا.
٥-لە ئەستۆگرتنی هەندێ کاری لە توانا بەدەر، کە دەبنە مایەی دودڵی و شڵەژان و ...بونی هەوڵەکان و نەمانی هاوسەنگی.
٦-بڕوابەخۆنەبون و لە توانای خۆ ڕانەدیتن بۆ ئەنجامدانی هەر کارێ.
٧-بێزار و هەراسان بون و بەردەوام نەبون لە کردنی هەر کارێ.
ئیتر فەرمو لەگەڵ چارەسەریەکانی ئەو چەند شێوەیەی، کە هەندێ خەڵکی نیگەران و ...فتار بوە:
١-تێر بخەوە بەڵام بێ زێدەڕۆیی، ئەگەر بەدەستنوێژیشەوە بخەوی ئەوا چاکترە.
٢-بەیانیان زوو لە خەو هەڵسە و زۆر لەبن جێ خۆت مەگنخێنە.
٣-نوێژی بەکۆمەڵی بەیانی لە دەست خۆت مەدە.
٤-زیکری بەیانیان لەبیر مەکە، کە کلیلی ئاسودەیی ڕۆژەکانتە.
٥-بەهێمنی پلان بۆ بەرنامەی ڕۆژانەت دابڕێژە، باشتریش بو ئەگەر چاوێکت پێ ...خشاندایەوە و لەسەر بڕگەکاندا وەك چێژ وەرگتن کەمێك بوەستابوایە.
٦-با بڕگەکانی بەرنامەکەت جۆراوجۆر بن و ئەو شتانەی تێدابێ، کە حەزت لێیانە و هەوڵ دە لەو شتەوە دەست پێ بکەی، کەوا پێشبینی دەکەی بەرێژەیەکی بەرز سەرکەوتنی تێدا وەدەست دێنی.
٧-دەستپێکی جێبەجێکردنی بەرنامەکەت بە دوعای چونە دەرەوە و دوعای سواربونی ترۆمبێل بێت-ئەگەر سواری بوی-.
٨-هەر برادەرێکت بینی بەزەردەخەنەوە سڵاوی لێبکە.[1]

[1] پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: ((تبسمك في وجه أخيك صدقة))الترمذي. وەرگێڕ

٩-برگە برگــە بەرنامەکــەت جێبــەجێ بکــە بــەو جــۆرەی، لەگــەڵ تــەواوبونی ڕۆژ، بەرنامەکەت تەواو جێبەجێ کردبێ و هیچ شتێکت بۆ بەیانی جێنەهێشتبێ.

١٠-کە گەڕایەوە ماڵــەوە گاڵتــە و ســوحبەت لەگــەڵ خــێزان و منداڵــەکانت بکــە، باشتریش بو ئەگەر دیاریت بۆ هێنابن، ئەوانــەی ســەرکەوتنێکیان لــەو ڕۆژەدا وەدەســت هێناوە قسەی خۆشیان لەگەڵ بکە و هاتیــان بــدە ئەوانــەش کــە نوشســتێکیان هێنــاوە یارمەتیان بدە نوشستەکەیان چارە بکەن.

١١-با بەرنامەکەت کاتی ئیسراحەت و وچان وەرگرتن و پیاسەی تێدابێ ئەگەر چــی کورتیش بێ.

١٢-لە بۆنە کۆمەڵایەتیەکانی دراوسێ و بــرادەر و خزمــان بــە شــێوەیەکی گونجــاو بەشدار بە.

## ڕوبەڕوبونەوەی دودڵی و شڵەژان:

١-بەچاوێکی ڕۆشنبینانە لە دونیا بڕوانە، تا دڵنیا بیت ئەم دونیایە هیچ کــەماڵێکی تێدا نیە، بەڵکو ئەگەر شتێ لایەنە چاکسازیەکەی بەسەر لایەنە کەموکورتەکەی زاڵ بێ، ئەوا مەبەستی ژیانی تێدا وەدی هاتوە.

ئەمە بیرکردنەوەیەکی واقیعیانەی ڕەوایە و لەمە بترازێ، پیاو لە نێو وەهم و خەیاڵان دەژی.

٢-هەمیشــە ئــەوەت لــەیادبێ، کــە داواکــراو لــە تــۆ ئەوەیــە کاربکــەی و دەســت بەهۆکارەکانەوە بگری، بەڵام ئەنجامە کۆتاییەکان لەژێر دەسەڵاتی خوادان.

٣-ژیانی پیاوە مەزنەکان بخوێنەوە و لێیان وردبەرەوە، تا بزانی کە ئــەوانیش کــەم و کورتی و نوشستیان هەبوە لە ژیاندا.

٤-بیر لەو سیفەتانەی خۆت بکــەوە، کــە هــێز و پێزیــان تێدایــە و دورن لــە کــەم و کورتی، تا لە میانەی ئەوانەوە نیعمەتەکانی خــوات بــۆ دەرکــەوێ و بزانــی، جگــە لــە سیفەتە لاواز و کەموکورتەکان سیفەتی بەهێزیش هەیە.

٥-ئەو چالاکی و کارانە بەبیر خۆت بێنەوە، کە سەرکەوتنێکی بەرزت تێدا وەدەست هێناون، هەرجارێ هەستت بە دودڵی و دڵساردی و شڵەژان کرد، دوبارە و سێبارە بــەیاد

خۆتیانی بێنەوە.

٦-ئەگەر تۆ شتی کامل و نمونەییت دەوێ، ئەوا پێویستە ڕێگەی کارکردن بگریتەبەر و هەوڵدەی پێیان بگەی نەك بوەستی و چاوەڕوان بی.

٧-ژیریت بەکاربێنە و لە کردنی هەرشتێکدا، هەردو حاڵەت لەگەڵ یەکتر بەراورد بکە، ئایا دەیکەی، یان نایکەی، بیرلەوە بکەوە کامیان باشترە و بەرژەوەندی زیاترە، ئەو هەڵبژێرە چونکە هەڵبژاردنی سێیەمت لەبەردەم دا نیە.

٨-ئەگەر لە هەندێ کاردا توشی فەشەل بوی بڵێ: ((**قدر الله وما شاء فعل و إنا لله و إنا إليه راجعون ولا حول ولا قوة إلا بالله، اللهم اجرني في مصيبتي واخلفني خيراً منها**: خوا وای تەقدیر کردوە و ئەوەی خوا ویستی ئەو هاتە دی، هیچ هەوڵ و هێزێکیش نیە لە خواوە نەبێ، خوایە لە پای ئەم بەڵایە پاداشتم پێ بدە و لە جێی ئەمەدا شتی چاکترم پێ ببەخشە)).

ئەو شتی لە لای خواوەش بەسەرت دێ لە قەدەری خواوەی بزانە و داوای لێخۆشبون بکە.

پاشان بە هێمنی و ئارامیەوە چەند جارێك لە هۆیەکانی فەشەلەکەوە بکۆڵەوە ئەگەر نەتویست کارێکی تر بکەی.

* * *

## ڕەفتارکردن لەگەڵ ڕەخنەدا

بێگومان مرۆڤ لە ڕێڕەوی ژیانیدا ڕوبەڕوی هەمو جۆرە کەسێك دەبێتەوە، ئەوانەی خۆشیان دەوێ، ئەوانەی رقیان لیّ دەبێتەوە ئەوانەی لایەنگیری دەکەن، هەروەها ئەوانەش کە ڕەخنەی لێدەگرن، ڕەخنەش بەپێی ئامانج و پاڵنەرەکانی ئەو کەسانەوە دەگۆڕێ کە ڕەخنەکە دەگرن، ڕەنگە دۆست بێ، یان دوژمن بێ، یان نزیك بێ، یانیش دووربێ.

ئەوەی لەسەر مرۆڤ پێویستە ئەوەیە، کە خۆی لەسەر نەرم و نیانی و سینە فرەوانی ڕابێنێ و ئارام بگرێ لەسەر ئەزیەتەکان، لەسەر شتی بێنرخ و کەم بایەخ توڕە نەبێ، ئەگەر توڕەش بوو توڕەبونەکەی لە ژێر کۆنترۆڵ دەرنەچێ، ئەگینا بەر لەوەی زیان بە کەسانی تر بگەیەنێ بەخۆی دەگەیەنێ و کەسێتیەکی ڤیناوی بۆ خۆی دروست دەکات و دەوروبەر بە وریاییەوە ڕەفتاری لەگەڵ دەکەن، هەروەها بەهۆی ئەم توڕەییەشەوە مافی رادەربڕینی کەسانی تر پێشێل دەکات، کە ئەمەش زیانێکی کۆمەڵایەتی لەباسنەهاتوی لێدەکەوێتەوە.

**ڕەخنەش دوو جۆری هەیە:**

### ا-ڕەخنەی بنیاتنەرانەی بابەتیانە:

بریتیە لەو ڕەخنەیەی کە بریندارکردنی هیچ کەسێکی تێدا نیە و بەبێ زێدەڕۆیی جەخت لەسەر لایەنە کەم و کورتەکانی کارەکە و باسی چۆنیەتی پڕکردنەوەی کەموکورتیەکان دەکات، هەروەها لایەنە چاك و تەواوەکانی کارەکەش بە بەرز هەڵدەنرخێنێ.

### هەڵوێست لەمەڕ ڕەخنەی بنیاتنەرانەدا:

١-دۆزینەوەی کەشێکی وا، کە لەگەڵ ڕەخنەی بنیاتنەرانە بگونجێ و هاندەری بێت.

٢-دڵخۆشی دەربڕین و بەگەرمی پێشوازی کردن و قسە کردن لە بارەیەوە. (**رحم الله من اهدى لنا عيوبنا**: خوا ڕەحم بەو کەسە بکات، کە عەیبەکانمان بەدیاری پێشکەش دەکات).

٣-وردبونەوە و تێفکرین لە ڕەخنەکە، بەچاوپۆشین لەوەی کە کێ گوتویەتی.
٤-هەوڵدان بۆ پڕکردنەوەی کەم و کورتیەکان و راستکردنەوەی ئەو هەڵانەی، کە ڕەخنەگرەکە ئاماژەی پێ کردووە.

## ب-ڕەخنەی ستەمئامێز و بەغەرەز:

بریتیە لە بەکارهێنانی کەم و کورتیەکانی کارێك، بەمەبەستی دەسبەسەر داگرتنی تەواوی کارەکە و تانە و تەشەر گرتن و بریندار کردن و تۆڵە وەرگرتنەوە لەو کەسەی کارەکەی ئەنجامداوە، هەروەها گرنگی نەدان بە ڕاستکردنەوەی کارەکە و وەدەرنەخستن و دامرکاندنەوەی لایەنە تەواو و ڕەواکانی.

## هەڵوێست وەرگرتن لەمەڕ رەخنەی ستەمئامێز:

١-هەوڵدان بۆ زانینی هۆیەکانی ڕەخنەکە وەکو:
(حەسودی، خۆپەرستی، ترسان لەکار، خۆ بەسەرخستن و تۆڵە وەرگرتنەوە، یان هۆی تر).
٢-هەوڵدان بۆ لابردنی هۆیەکان، ئەگەر بکرێ.
٣-زانینی ئامانجەکانی ڕەخنەکە و چاك رەفتارکردن لەگەڵیاندا.
٤-خەریك نەبون بە وەڵامدانەوەی رەخنەکان، مەگەر بەو ئەندازەیەی کە بونەتە مایەی بەربەستکردنی کارەکە، یان شێواندنی دیمەنەکەی.
٥-خەریك نەبون بە خۆسەرخستن، تا بەڵکو کارەکە وەلاوە نەنرێ و لەیاد نەکرێ.
٦-سود وەرگرتن لە ڕەخنەکە بۆ راستکردنەوە و چارەسەر کردن و چاککردنەوەی لایەنە کەم و کورتەکان.
٧-لەو رەخنانەی لێی دەگیرێن یان کە ئازارێ دەبینێ چاوەڕێی پاداشتی لای خوا بێ.
با مرۆڤ هەردەم ئەم فەرمایشتەی خوای لەیادبێ کە دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ: جا هەر شتێکی لە پێناو خواوە بێت ئەوا هەمیشەییە و دەمێنێ، بەڵام ئەو شتی لە پێناو غەیری خوابێ لەناو دەچێ و نامێنێ﴾الرعد/١٧.

* * *

## چارەسەری پەرت و بڵاوەبونی زەین و نەبونی تەرکیزی هزری لە کاتی کارکردندا

پەرت و بڵاوەبونی زەین گرفتێکە کە زۆر لە خەڵکی سکالای لیْ دەردەبڕن و لەگەڵ تێپەڕبونی تەمەن و زۆربونی گرفتەکانی ژیان گەورەتر دەبیْ. ئەم گرفتە چاکترین هێزی مرۆڤ کە لە تەواوی ئەفریدەکانی[1] تری جویْ دەکاتەوە لەکار دەخات، کە ئەویش بریتیە لە عەقل و هزر.

جا بۆ ئەوەی چارەسەری ئەم گرفتە بکەین پێویستە هەوەڵجار لە هۆیەکانی بکۆڵینەوە:

### هەندیْ لە هۆیەکانی پەرت و بڵاوەبونی زەینی:

١-هەبونی گرفتێکی یەخەگیر لە دەرەوەی کاردا، گرفتەکەش ڕەنگە خێزانی بیْ، یان پارە و پولی، یان گوزەرانی، یان کۆمەڵایەتی، یان سۆزی، یان هەر شتێکی تر بیْ.

٢-پێشبینی کردنی ڕوداوێکی ترسناك و پێوە خەریکبونی.

٣-تلانەوە بەدەست گرفتێکی تەندروستیەوە.

٤-ڕودانی شتێکی زۆر دڵخۆشکەر.

٥-ڕاهاتن لەسەر ژیانێکی وا، کە یەخسیری خەیاڵ و وەهمە ناواقیعیەکان بیْ و خۆی پێوە هەڵواسی بیْ.

٦-لە سنور و ژینگەی کارەکەدا شتێکی وا هەبیْ بیر خەریك بکات و ببێتە مایەی نامورتاحی، نمونە:

نارێك و پێکی و بێزەوەری شوێنی کارکردن، تەنگی و تەسکی شوێنەکە، زۆر گەرم، یان ساردی شوێنی کار، یان هەبونی ژاوەژاوێکی زۆر لە دەوروبەری شوێنی کاردا، یان بۆنی ناخۆش لە شوێنی کاردا، هەستکردن بە برسیەتی و پێویستیەکی زۆر، دڵخۆش نەبون بە هەندیْ لە هاوکاران، زۆری میوانەکانت، یان هی برادەرەکانت لە شوێنی کاردا.

---

[1] ئەفریدە: وەدیهێنراو، مخلوق.

## چارەسەرکردنی گرفتی پەرت و بڵاوەبونی زەینی لە میانەی کردنی کارێکدا:

بنیاتنانی توانای تەرکیزی زەینی و عەقڵی، پێویستی بە راهێنانێکی هێمن و درێژ خایەن بەڵام بەتین و ورد هەیە،هەروەکو ئەو کەسانەی، کە ماسولکەکانیان بنیات دەنێن و بەهێزیان دەکەن. دوای ئەم راهێنانە مرۆڤ لە هەر کات و لە هەر بابەتێکی مەبەستی بێ دەتوانێ هێزی زەینی خۆی خەست بکاتەوە و هزر و بیرکردنەوە عەقڵیەکانی جەم بکات.

تەرکیزی زەینی ئەوەیە کە مرۆڤ زەینەکەی خۆی بۆ ماوەیەك دەخاتە بەر کارتێکەرێك، یان کۆمەڵە کارتێکەرێکەوە، تا ئەوەی ئینتباعێکی رون و ئاشکرا وەردەگرێ، هاوکات زەینی خۆیشی لە روی سەرجەم کارتێکەرەکانی دادەخات.

کارتێکەرەکانیش بریتین لەو زانیاریانەی، کە لە میانەی یەك لە پێنج هەستەکانەوە وەردەگیرێن، کە بریتین لە: هەستی دیتن و گوێ گرتن و تامکردن و بۆنکردن و بەرکەوتن. پاشان زانیاریەکان لەبەر رۆشنایی ئەو ئەزمون و شارەزایی و زانیاریانەی، کە پێشتر وەریگرتون و ئەو رێبیر و بەهایانەش، کە مرۆڤەکە بروای پێ هەن تاوتوێیان دەکات.

هەڵبەت لە خۆ هێنانەدی سیفەتی تەرکیزی زەینی گەورەترین سود بە ژیانی مرۆڤ دەبەخشێ. یەکێك لە دەرونناسە ناسراوەکان دەڵێ: عەبقەریەت لە تەرکیزی زەینی بترازێ چیتر نیە. یەکێکی تر گوتویەتی: خەستکردنەوەی گرنگیدان بریتیە لە یەکەمین بنەمای عەبقەری بون.

یەکێکی تر دەڵێ: هەڵرشتنی تەواوی بایەخدانت لە کارێك، یان لە گرفتێك کە لە ژێر لێکۆڵینەوە دابێ، پاشان هەرکە یەکلابویەوە، یان بریارێکت لەبارەوە دا لە بیریان بکەیت و هێزی تەرکیزی زەینیت بگەرێنیەوە، بێئەوەی هیچ شتێکی لێ کەم بێ، یەکێکە لە هۆیە هەرە گرنکەکانی سەرکەوتن لە ژیان.

فەرمو لەگەڵ هەندێ هزر و هەنگاوی وا، کە یارمەتی ئەوەت دەدا لە پەرت و بڵاوەبونی زەینی دوربیتەوە و توانای تەرکیزت بینا بکات:

١-هەوڵدە هەمو ئەو شتانەی لە واقیعی دەوروبەرتدا -کە پێشتر وەك هۆ باسمان کردوە- کە هزرت پەرت و بڵاو دەکەن و زەینت سەرقاڵ دەکەن، دوریان بخەیتەوە.

٢-خۆت وا رابێنه له ساتەوەختی ئێستاییتدا بژیت، خۆت لەوەدا ببینەوە، کە ئێستا تێیدای و هەمو شتەکانی تر له بیر بکه، یان لەبیر خۆتیان بەرەوە.

((مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ آمِنًا فِي سِرْبِهِ مُعَافًى فِي بَدَنِهِ جُمِعَ لَهُ قُــوتُ يَوْمِــهِ وَلَيْلَتِــهِ، فَكَأَنَّمَا جُمِعَتْ لَهُ الدُّنْيَا بحذافيرها: ئەو کەسی له نێو گەلەکەیدا دوور له مەترسی بێ و لەش ساغیش بێ و نانی شەو و ڕۆژیشی هەبێ ئەوا وەك ئــەوە وایــە هــەمو دنیــای بــۆ کۆکرابێتەوە.))

ما مضى فاتَ والمؤمل غيب ولك الساعة التي أنت فيها

٣-ئەگەر هەستت بە کەشەنگی[١] کرد، ماوەیەك له کارەکەت بوەستە و له شوێنێکی فێنك و ئارام ئیسراحەتێ وەرگرە، باشتریشه ئەگەر لەسەر پشت پاڵدەیتەوە و چاوەکــانت بقوچێنی و بیرکردنەوەکەت رابگری و چــەند هەناســەیەکی قوڵیــش هەڵکێشــی، ئینجــا پاشان بگەڕێیتەوە سەر کارەکەت.

٤-ئەگەر هەستت بە خاو و سستی کرد، ئــەوا هەوایــەکی تــازە بــدە شــوێنەکەت و کەمێك له شوێنی خۆت بجولێوە و بۆ چەند دەقیقەیەکیش، چەند جموجۆلێکی ســوکەڵەی وەرزشی بکە.

٥-ئیسراحەتێکی تەواو بدە خۆت، بەر لەوەی دەست بکەی بە بیرکردنەوە، یان هــەر کارێ بکەی.

٦-یەکسەر دوای خواردن، یان لەکاتی زۆر برســیەتی و تێنوێتیــدا بــیر لــە مەســەلە گرنگەکان مەکەوە.

٧-زوو چارەسەری نەخۆشیە جەســتەییەکان بکــە، ئەگــەر نەخۆشــیەکت هــەبوو لــە ڕاددەی خۆی بەگەورەتری مەزانە و قەوارەیەکی گەورەتری لــە بیرکردنــەوەی خۆتــی پــێ مەدە.

٨-مەشقەکانی بەهێزکردنی تەرکیزی زەینی بکە، کە دەکرێ لەم هەنگاوانــە کــورت بکرێنەوە:

أ-هەمو مەسەلەکان کە پێویستیان بە بیرلێکردنەوە هەیە، کۆ بکــەوە و بــەگوێرەی گرنگیەکانیان، یان خێراییەکانیان ڕیزیان بکە و له پارچە کاغــەزێك بیاننوســە و لــەلای خۆتیان بهێڵەوە.

---

[١] کەشەنگ: شەکەت، ماندوو

ب-له حاڵەتی دڵ و دەرون ئارامیدا و له شوێنێکی ئـارام و دوور لـه هـەراوهۆریا و هەراسانی، کاغەزەکەت دەربێنه و یەکەم مەسەله تاوتوێ بکه و بیری لێ بکەوه.

ج-کێشەکەی یەکەم له گشت لایەنەکانەوه بخه ڕوو و به هێزه زەینیـەکانت تـەرکیزی بخه سەر وەك بڵێی لەم چەند خولەکەدا له هەمو مەسەلەکانی تر دابڕاوی. ئەم پرسیارانه بکه به بابەتی بیرکردنەوەکەت له کێشـەکەدا: (بۆچـی، کـەی، لـه کـوێ، چـۆن، کـێ، لەگەڵ..).

بۆچی دەمەوێ ئەم کاره بکەم؟ چ کاتێکی گونجاو هـەڵبژێرم؟ لـەکوێ بیکـەم؟ چـۆن جێبەجێی بکەم؟ کێ بەکارەکه هەڵدەستێ؟ لەگەڵ کێ ئەنجامی بدەم؟.

د-ئەو دەرەنجامانەی پێی دەگـەی لـه چـەند خاڵێکـا یـەك بەیـەك لـه کاغـەزێکدا تۆماریان بکه..

ه-چـاوێك بـه نوسـراوەکانتدا بخشـێنەوه، پاشـان چاوەکـانت بقوچێنـه و هــەوڵده بەبیرخۆتیان بخەیەوه.

و-چەند جارێك ئەم پرۆسەیەی تەماشاکردن و وەبیرخۆ هێنانەوەیه له چەند ماوەیەکی جیاجیادا دوباره بکەوه. بەهەر دەرەنجامێکی تازەش دەگەیت بیانخه سەر دەرەنجامەکانی تر.

ز-ماوه ماوه نوسراوەکەت دەربێنه و سەیری بکەوه و هەوڵده بیخەیه بەرچاوی چەند کەسێکیشەوه و داوایان لێ بکه تێبینیت بدەنێ ئەگەر له تواناییاندا هەبێ.

ح-پاشان بڕۆ سەر کێشەیەکی تر و بەهەمان شێوه تاووتوێی بکه.

دوایین جار له یاد نەکەی بیرۆکەکانت بکەیه کردەوه.

٩-چەند ڕاهێنانێکی تر بۆ بەهێزکردنی تەرکیزی زەینی:

ا-بابەتێك هەڵبژێره که حەزت لێی بێ و خۆت ناچار بکه بـۆ مـاوەی یـەك چارەگـه سەعات تەنها بیر لەو بابەته بکەیەوه، هەوڵده ڕۆژانه بەلایەنی کەمی شتێکی تازه لـەو بابەته بکەیەوه، ئایەتێك بێ، فەرمودەیەك بێ، دەروازەیەکی فیقهی بێ، یان ژیانی هەر ناودارێك بێ...).

ب-هەمو ڕۆژێ جارێك لەبـەردەم یـەك لـه دەلاقـەی کتێبخانەکـەت، ئەگـەر نـەبو لەبەردەم کەوەنتەری ناندینەکەت، ئەگـەر نـەبو لـه بـەردەم کەلوپەلـه عـەرزکراوەکانی بازارگەیەکی نزیك بوەسته و زۆر بەوردی و هێمنیەوه یەك یەك له شتەکان بڕوانه، پاشان

لەوێ لاچۆ و ئەو شتانەی لەوێدا هەبون لـەلای خـۆت بـەڕیز بیاننوسـە، پاشـان بچـۆوە بەردەمی و نوسینەوەکەت لەگەڵ شتەکان بەراورد بکە.

ج-بۆ ماوەی چەند دەقیقەیەك تەماشای شتێك بکە و پاشان چاوت لەسەری هـەڵگرە و بەیەکێك بڵێ پرسیارت لەبارەیەوە ئاراستە بکـات و، تـۆش وەبـیر خۆتـی بێنیـەوە و وەڵامی بدەیەوە.

د-سـەربەرەو ژێـر لــە ژمــارە (ســەد)ەوە تــا (یــەك) یــەك یــەك بژمــێرە. بەمجۆرە:١٠٠,٩٩,٩٨...تاد.

پاشان سێ سێ وەرە خوارەوە. بەم جۆرە: ١٠٠،٩٩،٩٨، ...تاد.

پاشان چوار چوار وەرە خوارەوە. بەمجۆرە: ١٠٠،٩٦،٩٢، ...تاد.

پاشان پێنج پێنج وەرە خوارەوە. بەمجۆرە: ١٠٠،٩٥،٩٠، ...تاد.

پاشان شەش شەش وەرە خوارەوە. بەمجۆرە: ١٠٠،٩٤،٨٨، ...تاد.

پاشان حەفت حەفت وەرە خوارەوە. بەمجۆرە:١٠٠،٩٣،٨٦، ...تاد.

پاشان هەشت هەشت وەرە خوارەوە. بەمجۆرە: ١٠٠،٩٢،٨٤، ...تاد.

پاشان نۆ نۆ وەرە خوارەوە. بەمجۆرە: ١٠٠،٩١،٨٢، ...تاد.

ئەم ڕاهێنانە بەلایەنی کەمەوە ڕۆژێ یەك جار بۆ ماوەی مانگێك دوبارە بکەوە.

هـ-کاغەزێك بێنە و لە ژمارە (١)ەوە تا ژمارە (١٠)ی لەسەر بنوسە، بەمجۆرە:

١-
٢-
٣-
٤-
٥-
٦-
٧-
٨-
٩-
١٠-

پاشان لە تەك هەر ژمارەیەکدا هەر وشەیەکی بە بیرتدا دێت بینوسە، پاشان یەك لـە پیتەکانی ئەلف و بێ هەڵبژێرە. ئینجا لە تەك هەر وشەیەك هـەر چـەندی پێـت دەکـرێ وشەی هاومانا بنوسە، یان ئەو وشانە بنوسە، کە بە هەمان ئەو پیتە دەست پێدەکەن کە

هەڵتبژاردون.

پاشان برۆ سەر ژمارەیەکی تر و هەمان شت دوبارە بکەوە، بەڵام با لەگەڵ ئەو پیتە جیاواز بێ، کە پێشتر هەڵتبژاردبو. بەمجۆرە برۆ دوێ تا گشت ژمارەکان تەواو دەکەی.

پاشان پرۆسەکە[1] بە وشەی تر و پیتی تر دوبارە و سێبارە بکەوە.

## گێڕانەوەی هاوسەنگی لە دوای فشارەکانی کاردا:

مرۆڤ تواناکانی سنوردارە و ناتوانێ پتر لەم سنورە خۆی ماندو بکات و لەسەروی توانای خۆیەوە بەرگە بگرێ، بەڵام هەندێ کەس بەمەبەستی پتر قۆستنەوەی دەرفەتەکان، یان لەبەر هیممەت بەرزی و زۆری جموجۆڵ و چالاکی، بە گەرم و گوڕیەوە بەرەو کارەکە دەچێ و پتر لە تواناکەی خۆی ماندو دەکات، تا ئەوەی توشی دودڵی و شلەژان و بێبەرهەمی دەبێ و ئەم فەرمودەیەی لەسەر جێبەجێ دەبێ: ((**فإنَّ المنبَت لا أرض قطع ولا ظهرا أبقي**: کەسێك وڵاخەکە ئەوەندە بار بکات کە پێی هەڵنەگیرێت، ئەوە نە زەوی و رێگەی دەبرێت، نە پشتیش بۆ وڵاخ دەهێڵێتەوە)).

ئەم گرفتە کە توشی زۆربەی کەسانی خاوەن هیممەتی بەرز دەبێ، پێویستی بە چارەسەرکردنە. فەرمو ئەمانەش چەند ئاماژەیەکن بۆ ئەم چارەسەریە:

١-هەمیشە وزەی بڕوا وەربگرە، چونکە وزەی بڕوا بریتیە لەو سوتەمەنیەی، کە مرۆڤ بە ئارامیەوە گەشتی ژیانەکەی پێ دەبڕێ، جا هەر چەندی بڕوای زۆربێ هێندە وزە و خۆڕاگرتن و تواناکانی زۆر دەبن.

ئێرە شوێنی باسکردنی رێگەکانی زیاد و بەرزکردنەوەی بڕوا نیە. بەڵام یاسا گشتیەکەی ئەوەیە کە بڕوا بە فەرمانبەریە(طاعة)کان زیاد دەکات، بە سەرپێچیەکانیش کەم دەکات.

٢-ئەرکێك لە ئەستۆ مەگرە، گەر لە توانات بەدەر بێ، لە بەرنامەکەتدا کات و توانا و بارودۆخەکەت لەبەرچاو بگرە، ئەگەر نا لە کارەکەتدا فەشەل دێنی و توشی دودڵی و بەدبەختی دەبی.

٣-بەرنامەکەت بەپێی یاسای لە پێش و لەپێشترکاری[1] دارێژە و گرنگی بە کارە هەرە پێویستەکان و ئەو کارانە بدە، کە ناکرێ دوایان بخەی. چونکە ژیانی سەردەم

---

[1] پرۆسە: عملية

ئەوەندەی لق و پۆپ و فرەکاری تێدایە، کە مرۆڤ دەخاتە نێو گێژەنێکەوە و نازانێ بەکام کار دەست پێ بکات و کام کاریش دوا بخات، بەلاّم ئەگەر بەگوێرەی بار و دۆخەکەتەوە کارە گرنگتر، یان سود بەخشتر، یان خێراترەکەت وەپێش خست، ئەوا دەتوانی بەشێوەیەکی بابەتیانە هەڵیانبژێری.

٤-پێویستە بەرنامەکەت، کە پەیڕەوی لێدەکەی کاری جۆراوجۆری تێدابێ، چونکە بەردەوامبون لەسەر ئەنجامدانی یەك جۆرە کار، دەرون توشی بێزاری و خاوبونەوە و ساردبونەوە دەکات، پاشان هەر کارێك ئەگەر زۆریش نەبێ لەسەر دەرون قورسی دەکات و بە زۆری دەخاتە بەرچاو.

٥-هەوڵدە بە شێوەیەکی بابەتیانە کارەکەت هەڵسەنگێنی، واتا وەك هەندێ لە کەسانی خاوەن ئاواتی گەورە گەورەت لێ نەیێت، کە تەنها لە حاڵەتەکانی زیان هێنان و سەرنەکەوتندا لە کارەکانیان دەڕوانن و هەرچی دەستکەوتەکانیشیانە لە بیری دەکەن و، هەر لەگەڵ وەدیهاتنیاندا جارێکی تر بەیادی خۆیانی ناهێننەوە. ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە جۆرێکە لە نکوڵی کردن لە نیعمەتەکانی خوا، گرتنە بەری ئەم ڕێچکەیە بە بەردەوامی دەبێتە مایەی هەست کردن بە دڵساردی و دودڵی و هەژاریەکی هەمیشەیی وا، کە هیچ شتێ ناتوانێ لە کۆڵ دەرونیان بکاتەوە.

٦-لەبیر مەکە مافی تەواوی دەرونەکەت بدەیت، با ئەمە ببێتە بەشێك لە بەرنامەکەت و بەهۆی کاری ترەوە پێشێل نەکرێت. ئەم مافەش خۆی لەوەدا دەبینێتەوە، کە مۆڵەتی خولی وەرگریت و هەوا گۆڕکێیەك بکەیت و دەرونت لە ماندوبون و ئازارەکان رزگار بکەیت و ئارامیەکی پێ ببەخشی، هەروەها ماوە ماوە ئیسراحەت بکەیت و مومارەسەی هیوایەتە ڕێپێدراوەکان بکەی، هەروەها خۆراکێکی چاك بە جەستەت ببەخشی و نەخۆشیەکانی چارەسەر بکەی. چونکە دەرونیش وەك چارەوێ[2] وایە، ئەگەر بارت لێ بارکرد بێئەوەی نان و ئاوی بدەیتێ و چاودێری نەکەی، ئەوا شەکەت و لاواز دەبێ و دەگلێ. باشتریش بو ئەگەر لەپای هەر دەستکەوتێ، یان هەر سەرکەوتنێ، کە خوا پێتی دەبەخشێ دیاری و پاداشتێك بە دەرونەکەت ببەخشی، با پاداشتەکەش بریتی بێ لە مۆڵەتێ، یان دیاریەك، یان شتێ لەم جۆرە بابەتە.

---

١ پێش و لەپێشترکاری: أولويات.

٢ چارەوێ: چوارپێ، ولاخ.

## چۆن باوەڕ بەخۆبون وەدەست دینی؟

باوەڕبەخۆبون ڕێگای سەرکەوتنە لەژیاندا، کەوتنە ژێر بــاری هەسـت کـردن بـە ڕوە تاریکەکان و دو دڵی و نادڵنیابون لە توانا بەردەستەکان سەرەتای فەشەل هێنانن، گـەلیٚ وزەش بەهەدەر دراون و بەفیڕۆ ڕۆیشتون، لەبەر ئەوەی ئــەو جـۆرە کەسـانە پـەیان بـەو توانایانە نەبردوە، کە خوا پێی بەخشیون، خۆ ئەگەر بەشـێوەیەکی ڕێکوپێـك بـەکاریان بهێنایە، ئەوا دەیانتوانی گەلیٚ شت ئەنجام بدەن.

فەرمو تۆ و هەندێ لەو هەنگاوانەی، کە دەکرێ بەهۆیانەوە لە گەلێك هزر و هەسـتە تاریکەکانی ژیانت ڕزگار بیت. جا ئەم هەستە تاریکانە لە هزردا بن، یـان لـە ڕەفتـار و خوڕەوشت و نەریت و وشەکان و شتی تر دابن. تا بتوانی لەســەر شـانی خۆتیـان بێنیـە خوارەوە و خۆت لە بارە قورسەکەیان ڕزگار بکەیت و بــە باوەڕییــەکی گـەورە و هیـوای گەشەدار و فرەوانەوە دەرونەکەت بەرەو ژیان بەریت:

١-بەبێ زێدەڕۆیی و کەم و زیاد کردن گرنگترین سیفەتە سلبیەکانی ژیانت دیاری بکە.

٢-هەمو هزرەکان یان سیفەتەکان لەیەکتر جیاکەوە.

٣-بەشێوەیەکی لۆژیکی[١] و شیتەڵکاریەوە بیریان لیٚ بکـەوە، تـاکو تـەواو شـارەزایان بیت، بەوە دەکرێ هۆ و حەقیقەتەکەی بناسی، کە ئایا لە ڕاستیدا حەقیقین، یان وەهـم و خەیاڵن.

٤-جا ئەگەر وەهم بن، ئەوا خۆتیان لیٚ ڕزگار بکە، ئەگەر واقیعێکی حـەقیقیش بـن، خۆت لە هۆیەکانی ڕزگار بکە و هەوڵدە بۆ کەمترین ڕاددە کەمیان بکەیەوە. بزانــە کـە سیفەتێك هەر چەندی پتر ڕەگی بەنێو ژیانتا هاوێشتبێ، لەخۆ دورخسـتنەوەش ئـەوەندە زیاتر پێویستی بە هەوڵدانی گەورە و زەمەنی درێژتر هەیە.

٥-زەین و هزرت لە ساتەکانی بیرسافی و دوای نەمانی سەرقاڵی و ڕەوینەوەی دودڵـی بە شێوەیەکی زۆر خەست بەهۆی هەڵوێستێکی گرنگی پۆزەتیڤانەوە بەیەکەوە گرێ بدە، هەمو وردەکاریەکان و دەنــگ و وێنــە و هەسـت و کەشـەکەت لەبـەرچاو بـێ. ئەگـەر بـەترۆپکی جموجۆڵـی زەینـی و دەرون ئـارامی و دڵفرەوانـی گەیشـتی و کەوتیـە نێــو دالغەیەکی قوڵ و لە واقیع دابــڕای، یـا خـەریکبو دابڕێـی، ئـەوا یەکسـەر جوڵەیـەکی دیاریکراوی جیا لە جوڵەکانی تر بکە وەك ئەوەی الله أکبر بکەی، یان سبحان الله بڵێی، یـان لا الـە الا الله دەربـڕی، لەگـەڵ ئـەم جوڵەیەشـدا ئاماژەیـەکی تایبـەتی بـە هــۆی

[١] لۆژیك: ژیربێژی، منطقي.

پەنجەکانتەوە بکە. با هەڵوێستەکە بۆ نمونە بریتی بێ لە مزگێنی رۆژی سەرکەوتنت لە ئەزمونەکان، یا رۆژی ژن گواستنەوەت بێ، یان شەوێك بێ، کە لە پێناو خوا شەونوێژت تێدا کردبێ، یا بیستنی هەواڵێکی دڵخۆشکەرانە بێ لە بارەی موسڵمانانەوە، یان با ئەو رۆژە بێ، کە بۆ یەکەمجار مەککە یان مەدینەت دیوە.

٦-ئەم شتە چەندین جار دوبارە و سێبارە بکەوە، تا ئەوەی هەڵوێستە ئیجابیەکەی بەهەمو هەست و ئاسەوارە دەرونی و هەستەکیەکانەوە بەشێوەیەکی تۆماتیکی لەگەڵ جوڵە دیاریکراوەکەت پەیوەست دەبێ. جا هەر کاتێکی تۆ ئەم جوڵەیە بکەیتەوە، یەکسەر بەشێوەیەکی تۆماتیکی دەچیە نێو حاڵەتە ئیجابی و بەرزە دەرونیەکەتەوە، ئەگەر چی هەڵوێستە ماددیەکەشت بەبیر بێتەوە، کە مایەی هەڵوێستەکە بون.

٧-ئەگەر لەهەر حاڵەتێکدا ئەم جۆرە هەست و بیرە تاریك و سلبیانە رویان تێکردی، ئەوا یەکسەر چاوەکانت داخە و لە هزرەکان برۆ دەرەوە و تابلۆیەك بێنە بەرچاوت، کە بە خەتێکی درشت و رەنگێکی تۆخەوە وشەی (بوەستە) نوسرابێ.

بۆ ماوەیەك لەم وشەیە رامێنە و چەند جارێك تێی بروانەوە، تا وەك بڵێی لەم وشەیە بترازێ چیتر نابینی.

٨-کەمێکی تر بە خەیاڵەکەتدا قوڵتر ببەوە و باخچەیەکی پڕ لە داروباری جۆراوجۆر و چەم و روبار و باڵندە و بولبول و شنەبای خەمرەوێن بێنە بەرچاوت، هەر بەچاو قوچاوییەوە ماوەیەك بیری لێ بکەوە و چێژی لێ وەرگرە.

٩-برۆ نێو حاڵەتە ئیجابیەکە و ئەو پەلە ئەندامەت بجوڵێنە، کە بۆتە کلیلی حاڵەتە ئیجابیەکە وەك لە برگەی (٥) باسمان کردوە- کەمێك نقوم بەردەوە، تا ئەوەی حاڵەتە دەرونیەکەت دەگۆرێت و هەستە سلبیەکانت بەیەکجاری ون دەبن.

١٠-پاشان بگەڕێوە سەر ئەو هزرەی، کە پێوەی خەریك بوی ودەتویست کارێك بکەی.

١١-ئەگەر دیسان هزرە سلبیەکان رویان تێکردیەوە؛ لەکار بوەستە، لەم ساتانە دەست هەڵگرە و تەنها لەنێو یادگاریەکانی حاڵەتە ئیجابیەکانت بژی.

١٢-لەبیرمەکە لە سەرەتا و کۆتاییدا هەر پەنا وەبەر خوا بەریت، چونکە هەر خوا گریان و خەنین دەسازێنێ و، بەهۆی ژیوانی دەربرین و لێبوردنخوازی و هەمیشە یادکردنی خواوە دڵەکان زندوو دەبنەوە.

* * *

# چۆنیەتی دروستکردنی بڕیارەکان

یەکێك لە هۆکانی سەرکەوتنی هەرکەسێك لە ژیاندا ئەوەیـە، کـە لـە هـەمو بـوارە جیاجیاکانی ژیاندا، بتوانێ لەکاتی گونجاو و بە لێزانیەوە بڕیارەکان بدات. جا بڕیارەکـە چ لە بابەت رەفتارکردن لەگەڵ خۆی بێ، چ لەگەڵ کەسانی تر.

گەلێ کەس هەن کار دەکەن و زەحمەتی دەکێشن و هەوڵێکی زۆر دەدەن، بەڵام کە لە قۆناغێك لە قۆناغەکانی کارەکەدا، لە ساتێکی یەکلاکەرەوەدا پێویستی بـە بڕیـارێکی گردەبڕ (حاسم) و ڕاست و دروست دەبێ؛ لەبـەر دودڵـی لـە ئاسـتێکی وادا نیـە، بۆیـە ناتوانێ بڕیارەکەی بدات جا لە ئەنجامدا یان بە یەکجاری کارەکەی لەدەسـت دەدات، یـا هەلێکی گەورەی لەدەست دەچێت، کە جارێکی تر نابەتەوە ڕێی.

بۆ دەرکردنی هەر بڕیارێك، چەند هەنگاوێك هەن، کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

١-کۆکردنـەوەی زانیـاری تـەواو و دروسـت و راسـت لـەبارەی ئـەو بابەتـەی، کـە مەبەستیەتی بڕیارەکەی لەبارەوە دەربکات. چونکە هەوڵدان بۆ دەرکردنی هەر بڕیـارێك بەهۆی چەند زانیاریەك ناتەواو و نادروست بن! دەبێتە مایەی دەرکردنی بڕیارێکی هەڵە، کە ئەنجامێکی خراپ و نابەدڵی لێ دەکەوێتەوە. بۆ نمونە: قوتابیەك ئەگەر لـە قۆنـاغی ئامادەیی سەرکەوتبێ و حەزی لێبێ بچێتە یەکێك لە کۆلیژەکان، بـەڵام دوودڵ بـێ لـە هەڵبژاردنی کۆلیژەکەدا. ئەوا لێرەدا دەبێ یەکەمجار هەڵسێ زانیاریـەکی تـەواو لـەبارەی گشت کۆلیژەکانـەوە وەرگـرێ، وەکـو: ژمـارەی سـەعاتەکانی دەوام کـردن، سیسـتەم و بەرنامەی خوێندنەکەیان، مەرجەکانی قبوڵبون، هەروەها ئەگەر لە فلان کۆلیج دەرچـێ، دوای دەرچونەکەی دەبێ چ جۆرە کارێك بکات؟.

٢-دەستنیشان کردن و دیـاریکردنی ئـەو سەرپشـکیانەی، کـە دەتوانـرێ وەدەسـت بهێنرێن بەگوێرەی ئەو زانیاریانەی، کە لە بارەیانەوە کۆکراوەتەوە. هەر لەبەر نمونەکـەی پێشو.. گریمان ژمارەی ئەو کۆلیژانـەی وەریدەگـرن پێنـج کۆلیـژن. ئنجـا دوای ئـەوەی زانیاری تەواو و پێویستی لەبارەیانەوە کۆکردەوە، سێ کۆلیـژ گونجـاون بتوانـێ تێیـاندا بخوێنێ و پێشبینی دەکات سەرکەوتنیان تێدا بێنێ و دوای دەرچونیش دەتوانێ کـارێکی وا بکات سەرکەوتنی تێدا وەدەست بێنێ.

٣-هەڵبژاردنی باشترین سەرپشکیە بەردەست و بەرتوانەکان. هەر لەسەر نمونەکەی پێشو، قوتابییەکە دەتوانێ بەهۆی تاوتوێکردن و بەراوردکردنی هەر سێ کۆلیژ یەکێکیان هەڵدەبژێرێ. جا بەراوردکاریەکە لەبابەت سروشت و ماوەی خوێندن و پسپۆڕیەکە بێ، یان لە بابەت هەموویانەوە بێ. گرنگ لەو کۆلیژە ناونوس بکرێ، کە خۆی مەبەستیەتی و هەڵیبژاردوە و حەزی لێیەتی.

٤- ئەگەر لە هەڵبژاردنەکە دودڵ بێ و نەیتوانی ئەولەویەت بداتە هیچ کامێکیان ئەوا با نوێژێکی ئیستخارە بکات و پاشان راوێژ بە خاوەن ئەزمونانیش بکات.

٥- جێبەجێکردنی بڕیارەکە، دوای ئەم هەنگاوانەی باسمان کردن، گەیشتۆتە ئەو رادەیەی کە هەڵبژاردنەکەی دیارکردبێ و بڕیارەکەی دابێ، بەڵام ئەوەی کە دەمێنێتەوە بریتیە لە جێبەجێکردنی بڕیارەکە، کە بریتیە لە بەروبومی هەنگاوەکانی پێشتر. بڕیارەکە بەبێ جێبەجێکردن هیچ نرخێکی نابێ.

ڕەنگە جێبەجێکردنەکە هەر ئەو کەسە بێ، کە بڕیارەکەی داوە، ڕەنگە لەژێر دەسترۆیشتوی و تایبەتمەندێتی کەسێکیتر، یان لایەنێکی تر بێ. هەروەها کۆکردنەوەی زانیاریەکیان و توێژینەوەی سەرپشکیەکانیش ڕەنگە لە ئەستۆی ئەوانەوە بێ، کە بڕیارەکە دەردەکەن، یان لە ئەستۆی دەستەی راوێژکاران بێ.

هەر لە نمونەکەی پێشتر، جێبەجێکردنی بڕیارەکە بریتیە لە بێنەوبەردەی ناونوس کردن لەو کۆلیژەی کە هەڵبژێردراوە. کە دەبێ زانیاری هەبێ لەبارەی کاتی ناونوس کردن و ئامادەکردنی دۆکیۆمێنتی[١] داواکراو و ئەو تاقیکردنەوە و دیداریانەی کە هەردەبێ ئەنجامیان بدات. هەروەها ناسینی ئەو لایەنەش، کە فۆرمەکەی بۆ تەقدیم دەکات و زانینی شوێنەکەی. ئەمانە هەموی یەك بە یەك جێبەجێ بکات، تا ئەو دەمەی ناوی تۆمار دەکرێ، موتابەعەی بکات. ئیتر قوتابیەکە لەو کۆلیژە وەردەگیرێ کە هەڵبژێردراوە.

## چەند هەڵوەستەیەك لەگەڵ بیر و بیرکردنەوەدا:

توانای بیرکردنەوە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ، کە خوا بە مرۆڤی بەخشیوە و ڕێزی لێناوە. جا ئەگەر مرۆڤ بەشێوەیەکی چاك ئەم توانایەی خۆی بەکارهێنا، ئەوا

---

١ دۆکیۆمێنت: بەڵگەنامە

بەسەر پەیژەی سەرکەوتن هەڵدەگەڕێ، ئەگەر بیری خۆیشی پەك خست، ئەوا دەست بە یەکێك لە گرنگترین هۆیەکانی فەشەلی ژیان دەگرێ. بەڵکو دەتوانی بڵێی: ئەگەر ژیان بیرکردنەوەی لێ دەرهاویشترێ، ئەوا لە سەرکەوتن خاڵی دەبێ.

(بیرکردنەوەش بریتیە لە پرۆسەی تاووتوێکردنی زانیاریەکان. بڕێکی گەورە لە وێنە و دەنگ و هەست پێ کردنی لە دەرەوە هەن و لە ڕێی هەستەکانەوە دەگەن بە مرۆڤ، هەروەها لە ناوەوەش لە کانگای یادگەدا[1] هەن. بیرکردنەوە ئەو پرۆسەیە، کە ئەم زانیاریانە لەبەر ڕۆشنایی سیستەمی بڕوا و بیروباوەڕ و بەهاکان پۆلێن و بەراورد دەکات و هەڵیاندەسەنگێنێ، پاشان ستراتیژێك دادەرێژێ، کە دەستەواژەی زمانی و ڕەفتاریەکانی لێ وەبەرهەم دێ، وێڕای ئەو کاریگەرە فسیۆلۆجیانەی، کە لە ماسولکە و هەناسەدان و ڕەنگی پێست و دەستەواژەکانی روخسارەوە دەردەکەون...).

بەرناردشۆی ئینگلیز دەڵێ: هەندێ کەس هەن لە ساڵێکدا، تەنها دوجار، یان سێ جار بیردەکەنەوە.

هزر کۆمەڵێك سیفەتی پەسند و کۆمەڵێك سیفەتی ناپەسندی هەیە. بۆ ئەوەی بتوانی بیرکردنەوەکانت لە سیفەتە ناپەسندەکان ڕزگار بکەی و بەرگی سیفەتە ئیجابی و سودبەخشەکان بپۆشێ؛ ئەوا لێرەدا چەند جۆرێك لە جۆرەکانی هزرت بۆ دەخەمە ڕو، هزرە سلبی و ئیجابیەکان:

## جۆرەکانی بیرکردنەوە :

١-بیرکردنەوەی داهێنەرانە: ئەو بیرکردنەوەیە، کە دادەهێنێ و داهێنان دێنێتە دی و شتی تازە دەخاتە ژیانەوە، واتا پرۆژەی سەرکەوتو و چارەسەری چاك و بڕیاری ڕاست و دروست دێنێتە ئاراوە و دەتوانێ زێڕ لە خۆڵ و مرواری لە قوڵایی دەریادا دەربێنێ، دەتوانین پێشی بڵێین بیری ئیجتهادی.

٢-بیرکردنەوەی ڕەخنەیی: ئەو بیرکردنەوەیە، کە دەتوانێ کەم و کورتی و هەڵە و نەنگیەکانی هەر کارێکی دامەزراو ببینێ، ئەگەر چی نەشتوانی جێداری[2] گونجاو بدۆزێتەوە بۆ ئەو ڕەخنانەی کە دەیگرێ.

---

١ یادگە: ذاکرة

٢ جێدار: بدیل.

٣-بیرکردنەوەی لەخۆگرانە (ئیستیعابی): ئەو بیرکردنەوەیە، کە دەتوانێ لە داهێنانەکانی کەسانی تر بگات و ئیستیعابیان بکات، ئەگەر چی نەشتوانێ داهێنان و شتی تازە بێنێتە دی و توانای داهێنان و نوێکاری و پترکاری (ئیزافەکاری) و بەخشینکاریشی نەبێ، دەتوانین ناوی بنێین بیری لاساکەرەوە.

٤-بیرکردنەوەی لێڵ و نارون: ئەو بیرکردنەوە تێکەڵ و پێکەڵەیە، کە پەی بە پەیوەندی نێوان شتەکان نابات و ناتوانێ قەوارەی شتەکانی ئەو بابەتەی بیری لێدەکاتەوە دیاری بکات، دەستەوسانیشە لەوەی بتوانێ بە رونی و ئاشکرایی هزر و بیر و هۆشی دەربڕێ.

٥-بیرکردنەوەی بەگومان: ئەو بیرکردنەوە پیلان ئامێزەیە، کە گومان لە هەمو کەس و لە هەمو شتێ دەکات، وا تێدەگا هەمو شتێ پیلان گێڕانە، خۆیشی ئامانجی پیلانەکەیە و هیچ هەوڵ و کارێکیش دادی نادات.

٦-بیرکردنەوەی سنورپەڕێن[1]: ئەو بیرکردنەوەیە، کە قەوارەیەکی گەورەتر لە قەوارەی راستەقینەی خۆی بە مەسەلەکان دەدات جا مەسەلەکە دڵخۆشی بێ، یان خەماوی. واتە مێشت لێدەکاتە گامێش و مەسەلەکەت هەند بە گەورە و گرنگ دێنێتە بەرچاو، تۆ سەرت سوڕ بمێنێ و دۆش دابمێنی، کەچی کە دەست بەکارەکە دەکەیت و خۆت مەسەلەکە دەبینی، بۆت دەردەکەوێ شتێکی زۆر ئاساییە بگرە لە ئاساییەکانیش ئاساییترە.

٧-بیرکردنەوەی ڕواڵەتیانە: ئەو بیرکردنەوەیە، کە هەر لە دیمەنی شتەکان دەوەستێ و ناپەڕێتەوە بۆ ناسینی حەقیقەت و کرۆکەکەی.

وەك ئەو کەسەی کە بەهۆی جلوبەرگ و ترۆمبێلەوە بڕیار لە چۆنایەتی کەسێکەوە بدات، بێنەوەی حەقیقەتی بیرکردنەوە و خوڕەوشت و ڕەفتار و ڕۆشنبیری و هەڵسوکەوت و شتەکانی تری ئەو کەسە بناسێ، کە دەبنە مایەی دیاریکردنی ڕێز و پلەی مرۆڤ.

٨-بیرکردنەوەی هەڵبەستانە[2]: ئەو بیرکردنەوەیە کە خاوەنەکەی چەندین جۆرە کار و هەڵوێست لەبارەی خۆیەوە دەگێڕێتەوە، کەچی لە ڕاستیشدا هیچێکی نەکردون. ئەوەندە قسەی پوچ و پاڵەوانێتی خەیاڵی بۆ خۆی دروست دەکات، تا لە کۆتاییدا بڕوا بەخۆی

---

١ سنورپەڕێن: المبالغ.

٢ هەڵبەستانە: الادعائي.

دەکات، کە ڕاستە وای کردوە. ئەم جۆرە کەسانە هێند درۆ دەکەن، تا لەلای خوا بەدرۆزن ناودێر دەکرێن، هێند درۆ دەکەن و دەڵێنەوە تا بڕوا بەخۆیان دەکەن.

زۆربەی ئەو کەسانەی کە دەکەونە داوی ئەم جۆرە بیرکردنەوە پەتانامێزانەوە، دەسبەتاڵ و تەمبەڵەکانن، کە هیچ کارێ ناکەن، بۆیە خۆیان دەخەڵەتێنن و بەچەند بانگەشەیەکی فشوفۆڵەوە خۆیان ڕازی دەکەن.

٩-بیرکردنەوەی شیتەڵکار و هۆ ئامێز: ئەو بیرکردنەوە لێوردبوەوەیە، کە وا لە خاوەنەکەی دەکات، کە لە هۆ و ڕێخۆشەکیی و ئەنجامەکانی هەر ڕوداوێك بکۆڵێتەوە و، لە مەبەستی ئەوانەی روداوەکەیان هێناوەتە ئاراوە، هەروەها لە وەرگرتنی هەڵوێستێکی گونجاو و دیاریکردنی ڕۆڵی خۆی وردبێتەوە.

١٠-بیرکردنەوەی پاساو ئامێز و قەدەری: ئەو بیرکردنەوەیە کە خاوەنەکەی خۆی لە بەرپرسێتی هەر شتێکی ڕو بدات دەردێنێ و ئازوبازەکەی[1] دەخاتە ئەستۆی قەدەرەوە و پاساو بۆ هەمو هەڵسوکەوتەکانی خۆی دێنێتەوە، جا ئەنجامەکانیان بەهەر جۆرێك کەوتبنەوە.

١١-بیرکردنەوەی هەندەکیانە(جزئي): ئەو بیرکردنەوەیە کە وا لە خاوەنەکەی دەکات بەشێوەیەکی قرتێنراو لە باسوخواسی تەواوی روداوەکە و جیا لە بنکە گشتی و هەموەکیەکەی، لە ڕوداوەکە بڕوانێ، کە لە ڕاستیدا ڕوداوەکە بەشێکە لەوان.

١٢-بیرکردنەوەی هەموەکی و کۆکەرەوەیی: ئەو بیرکردنەوەیە کە ئەوەی لا گرنگە لە کاروبارە گشتی و هەموەکیەکان بڕوانێ و ئاوڕ لە وردەکاری و هەندەکیەکانی شت و ڕوداوەکان نەداوەتەوە.

## بیرکردنەوەی نمونەیی چیە؟

دوای ئەم ڕانواندنە خێرایەی بە بەشێك لە جۆرەکانی بیرکردنەوە و باسنەکردنێکی فرەوان و نەهێنانەوەی نمونە لە بارەیانەوە، ئاماژەیەك بە جۆرێکی تر لە بیرکردنەوە دەکەین، کە دەکرێ بە بیرکردنەوەی نمونەیی ناوزەدی بکەین، کە لە سەرجەم بیرکردنەوەکانی پێشو هەڵێنجراوە.

---

[1] ئازوباز: ئەنجام، ئەو شتانەی بە دوایدا دێ.

کەواتە **بیرکردنەوەی نمونەیی:** ئەو بیرکردنەوە لە ئاراهێن و رەخنەیی و لەخۆگر و هۆ ئامێز و هەموەکی و وردکارەیە، کە پێیوایە گشت روداوەکـان بـەهۆی قـەدەری خـواوە دێنەدی، بەلاّم لە هۆیەکانیشـیان دەتوژێتـەوە، پێشـی وانیـە ئـەم توێژینەوەیـە لەگـەلّ قەدەری خوا نەسازبێ، چونکە دەزانێ هەر خوا وەدیهێنەری هۆ و هۆکارەکانە.

## تایبەتمەندییەکانی بیرکردنەوەی نمونەیی:

ئەو کەسەی توانای بیرکردنەوەی نمونەیی هەیە، گەلێك تایبەتمەندێتی هەیـە،کـە لـە کەسانی تری جوێ بکاتەوە، کە ئەمانەن:

١-ڕوانینێکی تیژ و زیرەکانەی هەیە و حەقیقەت و ناواخنی شتەکان دەبینێ و هـەر لەوەندە ناوەستێ سەرنجێکی ڕواڵەتیانە بداتە شتەکان.

٢-ڕاستگۆیی و جیددیەت و بەردەوامێتی لـە بیرکردنـەوە و قوڵبونـەوەکانی هەیـە، هێند بەقوڵی بیردەکاتەوە، تا دەگاتە ئەو وێنە نمونەییەی، کە کەمێ بەر لە ئێستا باسمان کرد.

٣-سەربەخۆ بون و لاسانەکردنەوەی کەسانی تر، چونکە هەندێ کەس بیرکردنەوەکەی خۆی بەگوێرەی دوایین وتە، کە دەیبیستێ، یان دوایین کتێب دەیخوێنێتەوە بینا دەکات. بۆیە هەرجارەی لەسەر جۆرە هزرێکی پێچەوانەیە لەگەلّ هزرەکـەی پێشـویدا، وەکـو ئیسفەنج وایە کە هەر شلەیەك لەسەری دابنێی هەڵیدەمژێ.

٤-تێکەڵکردنی جیهانی دەرەوەی دەوروبەری خۆت، کە دەبێتە بابەتی بیرکردنـەوەت لەگەلّ هەستە ناوەکی و ئەزمون و شارەزایی و زانیاریەکانی پێشوت. با ئەم تێکەڵکردن و ئاوێتەکردنە بە هاوسەنگی بێت.

٥-ڕونی و ڕەوانی و جودایـی ئـەو واژەیـەی[1] کـە ڕوانینەکـەی (ڕوئیایەکـەی) پـێ دەردەبڕی. چونکـە ئەگـەر زمـانێکی ڕەوانبێـــژ و ڕون و واتـــا دیـــار نـــەبێ هـــزرە پێگەیشتوەکەی پێ دەربڕێ، ئەوا وەك گەوهەری شـاراوەی ژێرگڵـی لێ دێـت. تەنانـەت وردی و ئاشکرایی و دەربڕین بەڵگەیە لەسەر وردی و ئاشکرایی بیرکردنەوە.

٦-ڕاستکردنەوەی هەست و هەڵچونەکان و وەشوێن نەچونیان بە بەردەوامی، چونکـە ڕەنگـە لەخشـتەبەر و هەڵـە و نادروسـت بـن، بـۆ نمونـە پیـاوێك شـوفێرێك دەبینـێ

١ واژە: لفظ

لەڕێگایەکدا ڕادەوەستێ و لــە ترومبێلەکـەی دادەبــەزێ و منــاڵێکی لــەخوێن شــەلاڵی هەڵگرتوە، پیاوەکە کە ئەم دیمەنە دەبینێ و تەماشای منداڵەکــە دەکـا، دەبینــێ ئەمــە کوڕەکەیەتی، ئیتر هورروژم دەکاتە ســەر شــوفێرەکە و ســەروگوێلاکی دەکوتــێ، چونکــە واتێدەگات ئەم شوفێرە ملی لە منداڵەکــەی نــاوە، کــەچی لــە ڕاســتیدا وانیــە، بــەڵکو شوفێرێکی تر ملی لە منداڵەکەی ناوە و بەحاڵی شڕ و خوێن بەربونــەوە لەســەر شــەقام جێی هێشتوە، ئەو شوفێرەش کە ئەوەی دیوە خێرا هەڵیگرتۆتەوە و ویستویەتی رزگــاری بکات.

## ئەو فاکتەرانەی تێڕوانینمان بەرامبەر بەشتێك دیاری دەکەن:

گەلێك فاکتەری فرچکی[1]، یان دەستکەوتەیی و خودی، یان دەرەکی کار دەکەنە سەر دیاریکردن و بڕی تێڕوانینمان بۆ ئەو شتەی، کە دەبێتە بابەتی بیرکردنــەوەمان، هــەندێ لە گرنگترین ئەو فاکتەرانە ئەمانەن:

**١-عەقڵ و تواناکانی:** خەڵك ئاستی جیاجیایان هەیە لە توانا عەقلیەکاندا. جا یان بەهۆی جیاوازبونیانە لە بنەڕەتی دروستبونەوە، یان بەهۆی جیاوازبونیانە لە ئامادەکردن و مشتومالکردنی عەقل و گەشەپێکردنی تواناکەیەتی. هی وا هەیــە خــاوەن زەینێکــی زیت[2] و زرنگی ڕۆشن هزر و تێوەڕوانینێکی تیژ و بەهێزی ئەوتۆیە، کە لەگەڵ کــەمترین ئاماژە پێکردنەوە لە حەقیقەتی کارەکان دەگات، مێشــك وشــکی واش هەیــە، کــە لــە حەقیقەتە دیار و ئاشکراکانیش ناگات. لە نێوان ئەم دوانەشدا گەلێك ئاســتی جیــاواز و بەرز و نزم هەن.

**٢-هەستەکان و مەودای توانا و ساغ و ســەلامەتییان:** لەبــەر ئــەوەی هەســتەکان پێناوی نێوان عەقڵ و ئەو شتەیە، کە دەبێتە بابەتی بیرکردنەوە. جا ئەگــەر هەســتەکان ساغ نەبن، ئەوا گەیاندنەکە بەنادروستیەوە دەبێ و دەبێتە مایەی وەرگرتنی تێڕوانینێکی هەڵە و کەم و کورت لەبارەی شتەکەوە. خەڵکیش ئاستی جیاجیایان هەیــە لــە مــەودای ساغ و سەلامەتی هەستەکانیانەوە، کەواتە ئاستی جیاجیاشــیان دەبــێ لــە تێڕوانینیــان بەرامبەر شتەکان.

---

١ فاکتەر: هۆکار، عوامل     فرچك: فطري.

٢ زیت: وریا، زەق، ئازا و توندوتۆڵ.

**٣-سامانی کەڵەکەبوی زمانەوانی**، کە دەیەوێ شتێکی پێ دەربڕێ و دەتوانرێ بەهۆیەوە وەسفی شتێکی پێ بکرێ و دیاری بکرێ.

جا هەرچەندی سامانی کۆبوەوەی زمانەوانی فرەوانتر بێ، توانای پیاو زیاتر دەبێ لە وەرگرتنی تێڕوانین و توانای دیاریکردنیشی بەهێزتر دەبێ.

**٤-ئەو بیروباوەڕ و بەهایانەی**، کە لەلای کەسی بیرکەرەوە و تێوەڕواندا هەیە. هەندێ لەم بیروباوەڕانە ئەمانە دەگرێتەوە:

بڕوابون بە غەیب، ئینتماکردن و شوناس[1]، بڕوابون بە توانا و لەباردا هەبونی مرۆڤ و ڕۆڵ و پیشە راستەقینەکەی.

**٥-واقیعی شتەکە** کە بوەتە بابەتی بیرلێکردنەوەکە و نیاز وایە تێڕوانینێکی لەبارەوە دیار بکرێ. هەر چەندە زانیاری زیاتر و قوڵتر و هەمەلایەنەتر و وردتر لە بارەی ئەم واقیعەوە هەبێ؛ تێڕوانینەکەی هێندە زیاتر راست و دروستتر دەبێ.

## کۆسپەکانی بیرکردنەوە:

١-ژیان لەنێو خەیاڵ و وەهم و خەونە پوچەکان و خۆ کوێرکردن لە حەقیقەتی واقیعەکان. خەیاڵ ئەگەر بۆ مەبەست و ئەندازەی ئەو پێشخستن و داهێنان و تازەخوازییانەی لە سنوری توانای کردندان و مرۆڤ هەوڵی وەدیهێنانیان دەدات؛ شتێکی چاك و سودبەخشە بەڵام ئەگەر بە ئاسمانی مەحاڵەکانی هەڵفڕێنن و لەبەر سێبەری مەحاڵەکاندا بژییێت و پشت لەکار بکات، ئەوا بێگومان دوچاری دەردی هزر کوژ و نەخۆشی عەقڵ فەوتێن بوە.

**٢-چۆکدادان و واتێگەیشتن کە توانای کردنی هیچ کارێکی نیە**، ئەو کاتە مرۆڤ بەویستی خۆی پەك بە هزر و عەقڵی خۆی دەخات، تەنانەت دوژمنیش ناتوانێ ئاوا زەفەرت پێ ببات وەکو ئەوەی، کە خۆت ئەم دیاریە بەخۆڕایی پێشکەش بە شەیتان دەکەی.

٣-ڕاڕایی و شڵەژان لەو کاتەی بیروبۆچونەکان تێك گیر دەبن و سەرپشکییەکان زۆر دەبن و ئەویش توانای نەبێ یەکێکیان هەڵبژێرێ و یەکلایان بکاتەوە، تا ئەوەی گشت دەرفەتەکان لەدەست دەچن و هەمو سەرپشکیەکان لەئارادا بزر دەبن.

---

١ شوناس: هوية

٤-چاولێکەری و لاساکردنەوەی کەسانی تر لەهەر کردەوەیەکی، کـە دەیکـەن و خـۆ راهێنان لەسەر تەمبەڵی و خەمساردی و ترسان و تۆقین لـە نوێخـوازی و سـەربەخۆبونی هزر.

٥-هاموشۆ و هاوڕێیەتی کردنی بێکار و بێئاگاکان ئەوانەی کە هەر سیفەتێك لـە سـیفەتەکانی پێشـویان لیٚ دێتـە دی- چونکـە مـرۆڤ ئەگـەر هاوڕێیـــەتی زیـــرەك و داهێنەرانی کرد لە بەهرەکانیان بەهرەمەند دەبێ، بەڵام ئەگەر هاوڕێیەتی لەگەڵ تەمبەڵ و خەمساردەکان کرد ئەویش دەردی ئەوان دەگرێ.

٦-خەریك کردنی عەقڵ و هزر بەو شتانەی، کە وەدیهاتنیان ئامانجی ئـەو نـین و لـە توانایان بەدەرن، وەك چۆن بیرکردنەوە و پەکخستنی عەقڵ سەرسەختبونێکە لە نیعمەتی خوا، بەهەمان شێوە خەریککردنیش بەو شتانەی، کە تایبەت بەو نین هەڵگرتنی بارێکی قورسترى لەتوانا بەدەرە. وەك ئەوەی هەوڵ بدا لـە کاروبـارە غەیبیـەکانی ڕۆژی دوایـی بگات، کە خوا تایبەتی کردوە بە زانستی خـۆی، یـان هـەوڵ بـدا ئـەندازە و چۆنایـەتی سیفەتەکانی خوای بەرز و باڵا دەست بزانێ.

٧-دەسبەتاڵی و خۆ خەریك نەکردن بەکارێکی سودبەخش، چونکە هزر گەڕیدەیـە[1] و ناتوانێ داسەکنێ و هێور بێتەوە، جا ئەگەر بـەکارێکی ڕەواوە خـەریکی نەکـەی، ئـەوا بەکارێکی ناڕەواوە خەریك دەبێ.

٨-بەدڵنەبونی ئەو کارەی کە دەیکەی بیرت پێوەی خەریکە، جا بە ناچاری بێ یا بـۆ چاووڕای خەڵکت بێ.

لەم کاتەدا هزر ناچار دەکەی بیری لیٚ بکاتەوە بێئەوەی بەدڵی بـێ، بۆیـە لێـی قـوڵ نابێتـەوە، بـەڵکو کـەمترین ڕاددە دێنێتـە دی، کـە کارەکـــە پێویســـتیەتی ئـــەویش بەشێوەیەکی لاســـاکاریەکی سـادە و بـە سـتایلێکی[2] دور لـە هـەمو جـۆرە داهێنـان و نوێخوازی و تازەگەریەك.

٩-دەستبەخۆ بەردانەوەیەکی لامێژانە[3]، واتا مـرۆڤ خـۆی وا ڕابێنـێ کەسـانی تـر لەجیاتی ئەو بیر بکەنەوە، تەنانەت لە تایبەتترین کاروبارەکانیشیدا، ئـەو کـات توشـی

---

١ گەڕیدە: گەڕۆك.

٢ ستایل: چەشن.

٣ دەستبەخۆبەردانەوەیەکی لامێژانە:التواکل الطفیلي.

شل و خاوی هزری و متبونی[1] عەقڵی دەبێت. وەکو ئەو روەکە لامێژانەی لەسەر لق و گەڵای داری تر دەژین، جا هەر کاتێکی گەڵاکە سیس بێتەوە، یا ببردرێ ژیانی روەکە لامێژەکەش کۆتایی پێ دێ. هەڵبەت لامێژی جیایە لەگەڵ راوێژکردن و سودوەرگرتنە ئیجابیەکانی لە کەسانی تر.

١٠-سستی هەستەکان، چونکە دەزگاکانی هزر و پەنجەرەکانی عەقڵ بریتین لە هەستەکانی، وەك بیستن و بینین و تامکردن و دەست لێدان و بۆنکردن.

جا ئەگەر مرۆڤ هەستەکانی خۆی لەسەر وردەکاری تێبینیەکان و خێرایی وەڵامدانەوە راهێنا؛ بۆ کار جموجۆڵتر دەبێ و دەبێتە باشترین یاریدەدەری بیرکردنەوەش. ئەگەر لەسەر خاو و سستی و تەمبەڵیشی راهێنا لە بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیدا، پەکی دەکەوێت و حاڵی وەك ئەوانە دەبێ، کە خوا لە بارەیانی فەرمووە: ﴿وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِنَ الْجِنِّ وَالإِنسِ لَهُمْ قُلُوبٌ لاَ يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لاَ يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ آذَانٌ لاَ يَسْمَعُونَ بِهَا أُوْلَئِكَ كَالأَنْعَامِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ أُوْلَئِكَ هُمُ الْغَافِلُونَ: ئێمە گەلێك لە جنۆکە و بە مرۆمان بۆ جەهەنندەم وەدی هێنا، دڵیان هەیە و پێی تێناگەن، چاویان هەیە و پێی نابینن، گوێیان هەیە و پێی نابیسن، ئەوانە وەکو ئاژەڵن؛ بگرە لەوان گومراترن، ئاگایان لەهیچ شت نیە.﴾الاعراف/١٧٩.

١١-گرفتاربون بە مشتومڕی نا پەسند و گفتوگۆی بێمەبەست و بێهودە، چونکە ئەم جۆرە گفتوگۆ و مشتومڕانە پیاو هەڵدەنێن تا پتر داکۆکی لە ناڕەوا بکات و دەبنە مایەی وروژاندنی رق و کینە و لەیەکتر توڕەبون و بەزاندنی بەرامبەر. لەجیاتی ئەوەی ببێتە مایەی تەباییبون دەبێتە مایەی دوبەرەکی. هەمو ئەمانە وا لە دەرون دەکەن سەرقاڵ بێ و بیرکردنەوەش دەشڵەژێنن و سەلیقەی داهێنانی نامێنێ.

* * *

---

[1] متبون: جمود.

# یادگە و خوێندنەوە

ڕەنگە مێشکی مرۆڤ سەیر و سەمەرەترین و ئاڵۆزترین دەزگا بێ، کە تا ئێستا ناسرابێ کە گەلێك بەشی جۆراوجۆری تێدایە، هەر لە مەڵبەندی بینین و بیستن و هەست پێ کردن و بۆنکردن و چێژکردنەوە بگرە، تا مەڵبەندەکانی زمان و جوڵە و داگرتنی زانیاریەکان و ئاراستەکردنی هەستەکان و پاراستنی هاوسەنگی لە هەمویان.

یادگە زانیاریەکانی نێو مێشك دادەگرێ، دوای ئەوەی بە یەك لە پێنج هەستەکانەوە تێدەپەڕێ و دەگەنە مەڵبەندەکانی یادگە. جا هەر چەندی ئەو هەستانە زۆرتر بن کە زانیاریەکان وەردەگرن، توانای پاراستنی زانیاریەکان گەورەتر دەبن. ئەو هەستەی کە وادەکا زانیاریەکان پتر لە یادگەدا ڕەگاژۆ[1] بن هەستی بینینە، بۆیە ئەگەر هەستی لەبەرکردنی زانیاریەك بریتی نەبو لە هەستی بینین، ئەوا هەوڵدە زانیاریە بیستراوەکە، یان چێژلێکراوەکە، یان بۆنکراوەکە بە وێنەیەکی بینراو ببەستیەوە.

کاتێکی تەواویش وەرگرە، تا وێنەکە بەهۆی وردبونەوە و چاوتێبڕین و تەرکیزەوە بەهەمو وردەکاریەکانیەوە لە یادگەدا شوێن وەردەگرن.

مشتومالکردن و بەهێزکردنی یادگە یان لاوازکردنی، کۆمەڵێك هۆی فرچکی هەیە جا بۆماوەیی بن یان بەهۆی تەندروستی دایکەکەوە بێ کە لە کاتی سکپڕیدا جۆرە خواردنێکی دیاریکراو بخوات کە کار لە کۆرپەکە بکەن. یا بەهۆی ئەو دەرمانانەوە بێ کە دەیخوات یان چەند جۆرە گازێك هەڵدەمژێ.

هەروەها کۆمەڵێك هۆکاری وەدەستهاتویی[2] هەیە وەکو ئەو خواردنەی کە خۆی دەیخوات، یا کەش و هەوای ئەو شوێنەی کە بیرکردنەوە و لەبەرکردن و دەورکردنەوەی تێدا ئەنجام دەدات، یا بەهۆی ئەو مەشق و ڕاهێنانانەی کە پەیڕەویان دەکات، کە پێشتر لە بابەتی تەرکیزی زەینیدا باسمان کردون.

---

١ ڕەگاژۆ: ڕەگ داکوتان.

٢ وەدەستهاتویی: کەسبی.

خوێندنەوەش دەورێکی باڵا دەگێڕێ لە دەستخستنی زانیاری و ڕۆشنبیریەکان، بەڵکو بریتیە لەو هۆکارە لاساکاریەی، کە زۆربەی خەڵکی جگە لەم ڕێگایە هیچی تر نازانن. هەر چەندی مرۆڤ پەرە بە ڕێگە و شێوازەکانی خوێندنەوە و ڕەفتارکردنی لەگەڵ پیتەکاندا بدات، پتر سود وەردەگرێ.

ئەو کەسەی خوێندنەوە دەکاتە هیوایەتێکی دانەبڕاو و پارچەیەکی جیانەبوەوەی ژیانی؛ بێگومان دوای ماوەیەکی کورت دەتوانێ لە هاوەڵەکانی باڵاتربێ و ببێتە خاوەنی بیرکردنەوە و شێوازێکی تایبەت بەخۆی لە ڕەفتارکردندا. ئەگەر بگەیتە ئەو ڕاددەیەی خوو بەخوێندنەوە بگری وای لێدێ کتێب خوێندنەوە لەلای تۆدا هەر تەنها نابێتە ئامرازێك بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری و تێگەیشتن لە بونەوەر، بەڵکو دەبێتە مایەی چێژ و ئارامی وەرگرتن، وەك گەشت و سەیرانی لێدێ و هیچ شتێ بارتەقای پڕناکاتەوە.

بابزانین بەهۆی خوێندنەوە چەند زانیاری وەردەگری، فەرمو لەگەڵ ئەم ژمارانە:

مرۆڤ لە ماوەی یەك دەقیقەدا دەتوانێ (٥٠٠) پێنج سەد وشە بخوێنێتەوە، هەندێ کەسیش هەن دەتوانن نزیکەی (٩٠٠) وشە بخوێننەوە، بەڵام ژمارەی ئەو جۆرە کەسانە زۆر کەمە.

(٥٠٠) وشە دەکاتە دوو لاپەڕەی کتێبێکی قەوارە مامناوەندی، واتە مرۆڤ لە ماوەی یەك سەعاتدا دەتوانێ (١٢٠) لاپەڕە بخوێنێتەوە، جا ئەگەر کتێبە مامناوەندیەکە (٤٠٠) لاپەڕبێ، کەواتە تۆ پێویستیت بە (٣) سەعات و (٢٠) دەقیقەیە تا بیخوێنیەوە.

گریمان تۆ پێویستیت بە (٤) سەعات هەیە تا دەیخوێنیەوە، جا ئەگەر تۆ ڕۆژێ یەك سەعاتت بۆ خوێندنەوە تەرخان کرد ئەوا لە ماوەی هەر چوار ڕۆژێك دا کتێبێ دەخوێنیەوە واتە لە ماوەی ساڵێکدا دەتوانی نەوەت (٩٠) کتێب بخوێنیەوە.

ڕامێنە، ئەگەر تۆ لە ماوەی ساڵێکدا نەك (٩٠) کتێب بەڵکو (٩) نۆ کتێبی هەڵبژاردە بخوێنیەوە چ کاریگەرێك دەخەیتە ژیانتەوە! داخەکەم ئاخۆ چەند کاتی بەهادارمان لە بێئاگایی و بێهودەیی و بێمەبەستی بەفیڕۆ دەڕوات، کەچی تەنها ئەو

کاته پەی بە برِی لە دەستچوی ژیانیشمان دەبەین، کە خۆری ژیانی بەســەردا ئـاوابوە و دەنگی بانگی خۆرئاوا بون هەلّبراوە.

چاکترین رەوشی خوێندنەوە ئەوەیە، کە لە کەشێکی بێدەنگدا بێ و لیّ وردبونەوەیی هەبێت و لە بارێکی هێمن و ئارامی دەرونیدا بێت، راستەوخۆ لــە پاشــی نـانخواردنێکی تێر و تەسەل، یان برسیبونێکی بەتین و تاوەوە نەبێت، روناکی و هــەوا گوّرِکــێ و پلــەی گەرمی و ساردی شــوێنەکە لــە بـار و گونجـاو بــێ، شـێوەی دانیشـتنەکە بــە قیتــی و مورتاحیەوە بێ. وا باشترە خوێنەر لە کاتی خوێندنەوەکەیدا قەلّەمێکی بەدەستەوە بــێ، تا بەلّکو لەژێر دەستەواژە گرنکەکاندا هێلّێك بکێشــێ، یـا ئەگـەر پێویسـت بـو چـەند سەربابەتێکی لەسەر بنوسێ، یا هەندێ ژمارەی لەسەر نیشان بکات، یا ئەوەتە هــەندێ لە هزرەکانی پوخت دەکاتەوە و کورتەیەك دەنوسێتەوە.

هەروەها وا باشترە لە دوای نوستنێکی تێر و تەواوە کاتی خوێندنەوەکەی هەلّبژێرێ.

* * *

# تەندروستیت

خۆشت راسپاردەیەکی، کە پێویستە بیپارێزی، جا وەکو یەکە چ پاراستنی روح بێ لە گومانەکان و وشکی بڕوایی، چ پاراستنی عەقڵ بێ لە ئەفسانە و پڕوپوچەکان، چ پاراستنی جەستە بێ لە نەخۆشی و پەتایەکان، چ پاراستنی هێز و چالاکیەکان بێ، جیاوازییان نیە. لەمیانەی ئەم خوارەوەدا دەتوانین باسی تەندروستی جەستە بکەین:

١-یاسا گشتیەکانی تەندروستی.

٢-خۆراك.

٣-نوستن.

٤-وەرزش.

## یاساگشتیەکانی تەندروستی:

١-پەیوەندی خۆت لەگەڵ خوا بەهێز بکە و پێویستیەکانت لەو بخوازە و بەردەوام یادەکانی بەیانیان و ئێواران و نوستن و لەخەو هەڵسان و کارەکانی تر بڵێ.

٢-وریابە لە زۆرخۆری، چونکە دەردێکی کوشندەیە و بشزانە، کە قەڵەوی دوژمنێکی سەرسەختی جەستەکەتە.

٣-ئەگەر توشی نەخۆشیەك بوی بەر لەوەی تەشەنە بکات چارەسەری بکە، ئەگەر چارەسەریەکە بەرێگەی سروشتی وەدی دەهات، ئەوا پەنا وەبەر دەرمانە کیمیاویەکان مەبە.

٤-خۆت لە خواردنی هێورکەرەوەکان[1] بپارێزە، لە کاتە زۆر زەروریەکان نەبێ بەکاریان مەهێنە.

٥-جگەرەکێشان کوشتنێکی بێگومانە، کارەساتی ماددە سڕکەر و سەرخۆشکەرەکانیش لەولاوە بوەستێ.

٦-لە خانوێکی خاوێن و هەواگۆڕ بژی.

٧-پاکوخاوێنی لە هەمو شتێکدا؛ مایەی ئاسودەبونە لە ژیاندا.

٨-خۆبەهێزکردن و خۆپاراستنە خولییەکانت باهەر هەبن.

---

١ هێورکەرەوەکان: المهدئات

٩-وریابـه لـه وەسوەسـەی هـەندێ لـه دکـتۆران، ڕەنگه جاروبار ئەم وریابون و خۆ پاراستنه باشترین دکتۆر بێ.

١٠-هـیچ چارەسـەرێکی سـیحری نـیه بـۆ نەخۆشیەکانت، بۆیه دەبێ لەگەڵ ئازاری نەخۆشیەکەت رابێیت و خۆت بگونجێنی.

١١-لەهـەر بـەڵا و نەخۆشـیەکی توشـت دەبێ چاوەڕێی پاداشتی لای خوابە، ڕەنگه نەخۆشیەکە ببێتە مایەی پاکبونەوەت له گوناهان.

* * *

**خۆراك :**

خـوای بەرز و باڵا دەست فەرمویەتی: ﴿**فَلْيَنْظُرْ الإنسَانُ إِلَى طَعَامِه، أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاءَ صَبًّا، ثُمَّ شَقَقْنَا الأَرْضَ شَقًّا، فَأَنْبَتْنَا فِيهَا حَبًّا، وَعِنَبًا وَقَضْبًا، وَزَيْتُونًا وَنَخْلاً، وَحَدَائِقَ غُلْـبًا، وَفَاكِهَةً وَأَبًّا، مَتَاعًا لَكُمْ وَلأَنْعَامِكُمْ**: دەی بـا مرۆ بڕوانێتە خۆراکی خۆی، ئێمە خۆمـان ئاوەکـەمان بـۆ رژتـوە، بە رژاندن، پاشان ئەم هەردەمان قەڵاشت، بە قەڵاشتن، ئەوسـا دانـەمان لێ ڕوانـد، رەز و سـەوزاییش هەروەتـر، بنەزەیـتون و دارخورمـاش، باغسـتانی چـڕ و پـڕیش. مـیوە و لـەوەڕی چـایەریش، بـۆ بژێـوی خۆتـان و ماڵاتەکەتان.﴾عبس/٢٤-٣١.

**چەند یاسایەکی زێڕین بۆ خواردن و خۆراك:**

١-ژیـرەکان دەخـۆن تـا بژیـن، دەژیـن تـا ئامانجـه بەرز و بەهادارەکان بێننه دی. (خواردن لەلای ئەواندا ئامرازە[١]). بەڵام ئارەزوپەروەران دەژین تا بخۆن و هیچی تر.

٢-تا برسی نەبی مەخۆ، چونکه خواردن لەسەر خواردن دەردێکی کوشندەیه.

٣-بـا خواردنەکـەت جۆراوجـۆر بـێ و زۆربەشـیان روەکـی بـن، بەتایبەتی میوە و سەوزەواتی تەڕوتازە، گۆشت و چەوری کەم بکەوە. باشتریشه ئەگەر حەفتەی جارێك، یان دووجار گۆشت بخۆی.

٤-تا پێت دەکرێ خۆت له خواردنی قوتیکراو و دروستکراو و هەڵگیراو بپارێزە.

٥-ورگـت پـڕ مەکـه، ئامۆژگاریـەکی ئەوتۆیه، که دکتۆرەکان بەدرێژایی رۆژگار بۆ هیچ ئامۆژگاریەکی تر هێنده هاودەنگ نەبونه.

---

١ ئامراز: وسیلة

٦-پاكوخاوێنی خواردنەكەت بەشتێكی كەم مەزانە، چونكە خواردنـی پیـس ژەهـرە نەوەك خۆراك.

٧-لە نێوان ژەمەكان شت مەخۆ، تەنها ئەگەر دكتۆر بۆی دانای.

٨-زۆر ئاو بخۆوە و لە پاكیەكـەی دڵنیابـە. باشتریشـە ئەگـەر خـۆت وا ڕابێنـی لـە میانەی خواردن و ڕاستەوخۆ دوای خواردنیش هیچ ئاو نەخۆیتەوە.

٩-خۆت لە زۆر خواردنی خێ و شەكرە دروستكراوەكان بپارێزە، چونكە لـە تەمـەنی گەورەییدا سەرەنجامی فەوتێنەری هەیە.

١٠-باشترە ئەگەر خۆت لـە خواردنـەوەی چایـە و قـاوە و سـاردەمەنیە غازییـەكان بپارێزی، یان بەپێی توانا كەمیان بكەیتەوە و لـە جیـاتی ئەوانـە، ئـاوێكی بێگـەرد و شەربەتی میوە و تەڕەی تەڕ و تازە بخۆیتەوە.

١١-دوای ئەوەی دەستەكانت دەشـۆی نـاوی خـوا بێنـە و بڵـێ: (بسـم الله)، ئـەنجا بەدەستی ڕاست خواردنەكەت بخۆ، لەبەر پێویستی نەبێ بەپێوە نە بخۆ و نە بخـۆوە. دوای ئەوەی لە خواردنەكەشت بویتەوە دەست و دەمت بشۆ و سوپاسی خوا بكە.

❊ ❊ ❊

**نوستن :**

خوای بەرز و باڵا دەست فەرمویەتی: ﴿**وَمِنْ آيَاتِهِ مَنَامُكُمْ بِاللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَابْتِغَـاؤُكُمْ مِنْ فَضْلِهِ**: لەنیشانەكانیەتی: خەوی شەوان و ڕۆژانتان، گەڕانتان بۆ دەسخستنی رسـق و ڕۆزی﴾الروم/٢٣.

نوستن یەكێكە لەو نهێنیەیانەی، كە خوا خستویەتیە نێو ئەفریدەكانی[١]، كـە مـرۆڤ بەهیچ جۆرێك ناتوانێ دەسبەرداری بێت. كاتێك ماندوێتی دەست لە مرۆڤ دەسـتێنێ و تەواو شەكەت و بێتاقەتی دەكات، نوستن باڵی بەسەردا دەكێشێ. پاشان كە هەڵدەسـتێ هێز و وزە و چالاكی و گەشێتیەكەی هاتۆتەوە بەرێ.

خەڵك بەزۆر شێوە ڕەفتار لەگەڵ نوستن دەكەن:

لەم چەند دێڕەی دادێت هـەوڵ دەدەم ئامـاژە بـە كۆمـەڵێك یاسـای هـەرە نمونـەیی ڕەفتاركردن لەگەڵ كێشەی خەوتن بكەم، تا ئەركەكـەی خۆیـت بـۆ جێبـەجێ بكـات و،

---

[١] ئەفریدە: دروستكراو، وەدیهێنراو.

نەبێتە هۆکاری بەربەستکردن و سستی نواندن لە جێبەجێکردنی ئەرکـەکانی سەرشـانت بەرامبەر بە خوا و بە خۆت و ژیان بەگشتی.

**فەرمو ئەمانەش یاساکانن:**

١-مافی هەسانەوەی لاشەکەت لەبیر مەکە لە هەر جۆرە بارودۆخێکدا بیت. چونکـە کەسێك ولاخەکەی ئەوەندە باربکات، کە پێی هەڵنەگیرێت، ئەوە نە زەوی و رێگە دەبڕێت و نە پشتین بۆ ولاخ دەهێڵێتەوە.

نەنوستنێکی تا درەنگی شەوان، کە لە توانا بەدەر بێ دەبێتـــە مایـەی وێرانکردنـی وزەی دەرون و ئیفلیجکردنی کارەکانی.

٢-چاکترین یاسا کە مرۆڤ لە بارەی نوستنەوە ناسـیبێتی ئەوەیـە، کـە دەڵـێ: زوو بخەوە و زوو هەڵسـە.

٣-لەروی زانستیەوە سەلمێنراوە کە چاکترین کاتی نوستن لــە دوای نوێـژی عیشـایە، هەر سەعاتێك نوستن لە سەرەتای شەودا بەقەد دوو ســەعاتی کۆتـایی هەیـە، چـەندین سەعاتی نوستنی ڕۆژیش ناگاتە یەك سەعات لە خەوی شەوێ.

٤-ڕاستەوخۆ دوای خواردن مەخەوە، بـا ماوەیـەکی خۆخاوکردنـەوەیان لـە نێوانـدا هەبێ.

٥-خراپترین کاتی نوستن لە سەرەتای رۆژێیە، یان نێوانـــی عەسـر و مەغریبــە، وەك دەڵێن: هەمو یاسایەکیش حاڵەتی تایبەتی جوێ لە یاساکەی هەیە.

٦-وەك ئەو کەسانە مەبە کە زۆربەی ژیانیان لەسەر جێگا دەبەنە ســەر، بـەڵکو لــە کاتی پێویستدا بخەوە، کە پێویستیش نەبو جێخەو جێ بهێڵە.

٧-خۆت وا رامەهێنە بەپێی چەند نەریتێکی چەسپاوەوە خەوت لێبکەوێ وەك جۆری جێخەو و بڕی روناکی و نەبونی دەنگە دەنگ، بەڵکو هەوڵدە خـۆت وا رابێنـی کـە لـە هەمو جۆرە بارودۆخێکدا خەوت لێ بکەوێ.

٨-مرۆڤ دەتوانێ بەرەبەرە خۆی وا رابێنێ پێویستی بە کەمێك خەوتن هەبێ.

٩-دوعای نوستن و هەڵسان لەبیرمەکە و هەمیشـە یـادی خـوا بکـە، کـە لـە خـەو هەڵدەستی.

❊ ❊ ❊

**وەرزش :**

یەکێك لە چاکترین ڕێگەکانی پاراستنی جموجۆڵی و چالاکی جەستە و توانای جێبەجێکردنی ئەرکەکانی ژیان  وێڕای خۆراکی چاك و نوستنی تێر و تەواو- بریتیە لە وەرزش، کە ئەویش بە بڕێکی پێویست و تێر و تەواوی ئەنجام بدرێ.

وەرزشی ڕێك و پێك ڕێگایەکە بۆ پاراستنی هێز و وزە و تەندروستی جەستە، ئامانجی وەدیهاتنی ژیان نیە تا لە پێناویدا هەندێ کەسی خۆش بوێ و هەندێکی تریشی ڕق لێبێتەوە، یان هەمو شتێکی ژیانی لە پێناودا تەرخان بکات.

ئەمانەش هەندێ ئاڕاستەکردنی گشتین بۆ ڕەفتارکردن لەگەڵ وەرزش:

١-با وەرزش ببێتە بەشێکی بەرنامەکەت و لە هەمو بارودۆخێکدا لە بیری نەکەی، کەمترین ڕاددەش با ڕۆیشتن و مەلەوانی بێت.

٢-ئەوەندە خوو بە وەرزشەوە مەگرە، کە ببێتە ئامانج و هەمو بەرپرسیێتیەکانت بەرامبەر خوا و خۆت و خێزانت بەلاوە نێی و، توشی کێشە و سەرێشەت بکات لەگەڵ کەسانی تر.

٣-راوێژ بە کەسێکی پسپۆر و شارەزا بکە، تا ڕاهێنان(تمرین)ی جۆراوجۆری وات بۆ دانێ گشت لاشەت بگرێتەوە، بەمەرجێك ڕاهێنانەکان ئاسان بن و کاتێکی زۆرت لێ نەگرن، تا ئەگەر لە سەفەریش بووی بیانکەیت.

٤-ئەگەر مەلەوانیت بۆ هەڵکەوت بێ‌یەك و دوو بیکە، چونکە یەکێکە لە خۆشترین و باشترین وەرزشەکان.

٥-وریابە لە ڕاهێنانە ترسناك و توندوتیژەکان، ڕەنگە ئازارت بدەن و توشی گوناهیشت بکەن.

٦-ڕاستەوخۆ دوای ئەوەی برسیەتی زۆری بۆ هێنابوی و تێروپڕت خوارد وەرزش مەکە.

٧-چاودێری خوا لەبیرمەکە لەسەر وتە و کردەکانت لەو کاتەی وەرزشەکەت دەکەیت.

*   *   *

# بەشی دووەم

# تۆ و کەسانی تر

## بەرەو پەیوەندییەکی چاکتر و پەیوەندی پێکردنێکی تەواوتر

## بەردەوامێتی پەیوەندیکردن لەگەڵ کەسانی تر و کارتێکردنیان

وشەی پەیوەندی پێکردن زاراوەیەکی بەربڵاوە لەلای کارگێڕ و کۆمەڵناسەکاندا و زۆریان بەکارهێناوە و گەلێکیان بایەخ پێداوە، لە تۆژینەوە هاوچەرخەکانیشدا کە تایبەتن بەم بوارە، بە بەرفرەوانیەوە لە بارەیان نوسیوە و تاووتوێیان کردوە.

**مەبەست لەم وشەیە:** بریتیە لە گرتنەبەری باشترین ڕێگا و ئامراز بۆ گواستنەوەی زانیاری و واتا و هەست و ڕاوبۆچونەکان بۆ کەسانی دیکە و کارتێکردنیان لە ڕوی هزر و ئاڕاستەکانیان و قەناعەت پێهێنانیان بەو شتانەی کە مەبەستتە، جا لە ڕێگەی زمان بێ، یان بە ڕێگەیەکی تر.

**پەیوەندی پێکردن سێ ڕەگەزی سەرەکی هەیە:**

١-نێرەر.

٢-وەرگر.

٣-پەیام.

بۆ ئەوەی پرۆسەی پەیوەندی پێکردنەکە سەرکەوتوانە و بەکاریگەر بێ، پێویستە لە هەرسێ ڕەگەزەکەدا مەرجەکانی سەرکەوتن بێنەدی.

### قۆناغەکانی پەیوەندی پێکردن:

پەیوەندی پێکردن تا بۆ ئەوەی لە پرۆسەی پەیوەندیکردن و کاریگەریەکەیدا سەرکەوتو بێ، پێویستە چەند قۆناغێك ببڕێ، کە لەم چەند هەنگاوەی خوارەوە کورتیان دەکەینەوە:

**١-حەز و وروژێنەر و هەڵنەرێك هەبێ لەلای نێرەرەکەوە، کە سەرچاوەی پەیامەکەیە.** ئەمەش وا دەخوازێ ئامانجێکی ڕون و ئاشکرای هەبێ و ئامانجەکەش شتێکی حەزلێکراو بێت. ئەگەرنا پرۆسەی پەیوەندی پێکردنەکە مردۆخ و بێ تین و تاو دەبێ. کەواتە نێرەر بڕوایەکی بەهێزی تێکەڵ بە خوێن و گۆشتی هەبێ و بەر لەوەی بەزمان دەری ببڕێ بە دڵ گوزارشتی لێ کردبێ و گشت خانەکانی لەشی ئەم مەبەستەیان دەربڕیبێ. هەر چەندی بڕوابون بە ئامانجەکە بەهێزتر بێ، ئەوەندە زیاتر هاندانی ڕاگەیاندنی پەیامەکە تەواوتر و بەکاریگەرتر دەبێ.

**٢-دیاریکردنی شێوازی پەیامەکە.** دوای ئەوەی نێرەرەکــە ئامانجــە خوازراوەکــەی خۆی لە پرۆسەی پەیوەندی پێکردنەکە دیاری دەکات، دەبــێ شــێوازێکی گونجــاویش بــۆ پەیامەکە دیاری بکات. وەدیهێنانی ئەم ئامانج و پەیامە بــەپێی جــۆری ئامانجــەکان و جیاوازی وەرگرەکانەوە دەگۆڕێت، ئەو پەیامەی، کــە گــەیاندنی هــەواڵێکی بــە ئامــانج گرتوە جیاوازە لەگەڵ ئەو پەیامەی کە ئامانجیــەتی هزرێکــی دیــاریکراو بگەیــەنێ یــان ئامانجی بەخشینی خۆشییەك بێ. هەروەها ئەو پەیامەی کە چینی زانکــۆی بــە ئامــانج گرتوە، جیاوازە لەگەڵ ئەوەی کە چینــی نــەخوێندەوار و رەشــۆکی خــەڵکی بــە ئامــانج گرتوە، کە نە دەزانن بخوێننەوە نە دەشزانن بنوسن.

پێویستە لە کاتی دیاریکردنی شێوازی پەیامەکەدا، کاردانەوەکانی ئایندە لەبەر چاو بگیرێنو ڕەچاوی گۆڕان بەسەرداهێنانی شێوازەکەش بکرێ، کەپێویستێ بۆ کاردانەوەکان. پەیامی سەرکەوتو ئەو پەیامەیە، کە دەتوانێ وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە:

ا-چ مەبەستێکم هەیە لەم پەیامەدا؟

ب-کەی دەمەوێ مەبەستەکە بێتە دی؟

ج-لەکوێ دەمەوێ بیهێنمەدی؟

د-چۆن بیهێنمە دی؟

ه-بۆچی من ئەم مەبەستەم هەیە؟

ئەم پرسیارانە پێویستە بۆ خودی خۆت بن و، خــۆت وەڵامیــان بدەیتــەوە و شــێوازی پەیامەکەت بە گوێرەی ئەم پرسیارانەوە رێك بخەی.

٣-جێبەجێکردنی پەیامەکە بە کردەیی و راپەڕاندنی لەسەر ئــەرزی واقیعــدا. واتــە مرۆڤ لە دوای ئەوەی شێواز و نەخشەسازی پەیامەکــەی لــە لایــەنی تیۆریــەوە دیــاری دەکات ئەوجار بچێتە سەر لایەنی کردەیی، کە بریتیــە لــە جێبــەجێکردنی پەیامەکــە و ناردنی بۆ وەرگرەکە.

ئەمەش وات لێ دەخوازێ لێهاتویی و مەشقت لەو بوارەوە هەبێ. یەکەمین هــەنگاو لە جێبەجێکردندا ئەوەیە، کە سەرنجی وەرگر راکێشیت و بە جولەیەك، یان نوکتەیەك، یا وتەیەك، یــان هــاوارێك، یــا باســکردنی ئامــانجێکی خۆشەویســت لــەلای وەرگرەکــەدا کاریگــەرێکی بخەیتــە ســەر و ببێتــە دەروازەیــەك بــۆ ئــەو پەیامــەی مەبەســتتە پێــی رابگەیەنی، ئەمە لەلای زانایانی رەوانبێژی پێی دەڵێن (براعــة الاســتهلال: لێوەشــاوەیی

دەستپێك).جا ئەگەر مرۆڤ لە دەستپێکدا سەرکەوتنی هێنا، ئەوا زۆربەی جار لە ڕاگەیاندنی پەیامەکەشدا سەرکەوتن دێنێ.

پاشان بچیە سەر هەنگاوی ناردنی پەیامەکەت و لەگەڵ کارتێکەرەکەی پێشو گرێی بدەی، وریابە لەوەی کە هێرشێکی ڕاستەوخۆ بکەیتە سەر ئەو هزر و بەڵگەنەویستانەی، کە بەرامبەرەکەت شانازی پێوە دەکات. بەڵکو هەوڵ بدە لە میانەی چەمکە هاوبەشەکانی نێوانتانەوە بیهێنیە قەناعەت. ئەو کەرەستانەی، کە بە هۆیانەوە پەیامەکەی پێ ڕادەگەیەنرێ ئەمانەن:

ا-زمان.

ب-پلەی گرێتی دەنگ.

ج-دەربڕینەکانی ڕوخسار.

د-جوڵەی جەستەیی وەك هەردو دەست و ئەوانی تر.

هـ-ئەو کەرەستە دەرەکیانەی لەگەڵیاندایە.

دوایێ بەیاریدەی خواوە پتر باسیان لێدەکەین.

**٤-وەرگرتنی پەیامەکە**، لە کاتی جێبەجێکردنی پەیامەکەدا لایەنی بەرامبەر کە ئامانجی پەیامەکەتە دەکەوێتە باری وەرگرتن و کارلێکردن لەگەڵ پەیامەکەتدا، جا بە سلبی بێ یان ئیجابی. گەلێ فاکتەر[١] هەن کە کار لە چۆنیەتی وەرگرتنی مرۆڤ بۆ هەر پەیامێك دەکەن کە ئاراستەی دەکرێ، هەندێ لەو فاکتەرانە ئەمانەن:

بیروباوەڕەکانی وەرگر، ڕۆشنبیری، باری دەرونی، ئیسراحەتی جەستەیی، ئەو ئاسایش و ترسەی کە تێیدا دەژێ، مۆرکسازیەکەی[٢] لە بارەی نێرەری پەیامەکەوە، مەیل و ئارەزوەکانی، پێویستبون و تێرخوازیەکەی[٣] بۆ پەیامەکە و، گونجاوی پەیامەکە لەگەڵ ئاستەکەی، چاك گوێڕادێرانەکەی.

**٥-کاردانەوەی وەرگرەکە لەسەر پەیامەکەدا**، کە بریتیە لەو ئامانجەی کە نێرەرەکە مەبەستیەتی بیگاتێ. جا ئەگەر کاردانەوەکە ئیجابی بێ و پەیامەکەش قبوڵ بکرێ، ئەوا ئامانجەکە هاتۆتەدی، ئەگەر سلبیش بو واتە پەیوەندی پێکردن و پەیام

١ فاکتەر: هۆکار

٢ مۆرکسازی: إنطباع.

٣ تێرخوازی: إشباع.

ڕاگەیاندنەکە و کاریگەرخستنە سەر وەرگرەکە سەرکەوتنی وەدەست نەهێناوە.

## جۆرەکانی پەیوەندی پێکردن:

پەیوەندی پێکردن و کار لە خەڵکی کردن چەندین شێوە و شێوازی جۆراوجۆری هەیە، مرۆڤ هەر چەندی بتوانێ بەباشتر شێوازەکان بەکاربینێ، سەرکەوتنەکەی خێراتر دەبێ لە ژیاندا.

ئەو کەسەی کارامەیە لە ڕەفتارکردن لەگەڵ خەڵکی و کارتێکردن و قەناعەت پێ هێنانیان بۆ ئەو مەبەستانەی، کە خۆی نیازی وایە پێیان بگات؛ ئەوا دەرگاکانی بۆ واڵا دەبن و بە ئامانج گەیشتن و هاتنە دی مەبەستەکانی بۆ ئاسان دەبن و لە ژیاندا سەرکەوتو دەبێ، دەشتوانێ خەڵکانی دەوروبەری بخاتە خزمەتی وەدیهێنانی ئامانجەکانی. جا ئەوانەی کە لە دەوروبەردان، ئەندامانی خێزانەکەی بن یانیش برادەر و دراوسێ و هاوڕێیانی بن.

گەیاندنی پەیام یان بەهۆی قسەکردنەوە دەبێ، یان بەهۆی شتی تر. جا هەرچەندی شێوازەکانی قسەکردن و ئەوانی تریش بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکە و گەیاندنی پەیامەکە پتر بێ، کارتێکردنەکە گەورەتر و بە تینتر دەبێ.

## پەیوەندی پێکردن بەهۆی قسەوە:

قسەکردن بەربڵاوترین و کاریگەرترین کەرەستەی پەیوەندی پێکردنە و مرۆڤ هەرچەندی لە هونەری قسەکردندا شارەزا و لێزان بێ، هەرچەندی بتوانێ زمان پاراو و ڕەوانبێژ بێ، ئەوا دەتوانێ کاریگەرێکی گەورەتر بخاتە سەر کەسانی تر و بەو ئاراستەیە بیانبات، کە خۆی مەبەستیەتی.

تەنانەت قورئانی پیرۆزیش -بە پلەی یەکەم بەهۆی ڕەوانبێژی و زمان پاراویەکەیەوە، شانبەشانی موعجیزەکانی تری- توانی گەردنی عارەبان کەچ بکات. پێغەمبەریشمانﷺ لەم بارەوە گەیشتبوە ترۆپکە و، کاریگەری وتەکانی ئەو پەڕی پلە و بەرزترین پایەی وەرگرتبو.

ئەم چەند ئاراستەکاریانەی خوارەوە ئەگەر هەر یەکێك پەیڕەویان لێ بکات تا ڕاددەیەکی زۆر دەتوانێ سەرکەوتن بەدەست بێنێ و پەیامەکەی خۆی بەهۆی قسەکردنەوە ڕاگەیەنێ:

١-هەڵبژاردنی وشەی ڕەوان و هەڵنەر، کاریگەرێکی بێئەندازەی لە گەیاندنی واتاکان بە وەرگر هەیە. هەروەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (( إن من البيان لسحرا: وتـەی ڕون و ڕەوان سحرێك لە کاریگەری بەرپا دەکات)). ئەی قورئان نەبو بەهۆی ڕەوانبێژیەکەیەوە عەقڵ و دڵی عەرەبەکانی یەخسیر کرد و وایلێکردن لە دەرونی خۆیان جوێ ببنەوە و بـە خۆشی و ناخۆشیەوە جلەوی ڕوحیان بدەنە دەست وشە پاراوەکانیەوە؟!

یەکێك لە باشترین ڕێگاکانی وەدەستخستنی رەوانبێژی، لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز و بەشێکی زۆرە لـە فـەرمودەکانی پێغەمبـەر ﷺ ، هـەروەها لەبـەرکردنی شـیعر و دەستەواژەی ڕەوانبێژ و زمانپاراوەکانە.

دەتوانی بۆ ئەم مەبەستە بەرنامەیەك دارێژیت و دەفتەرێکی تایبـەتت لـە لادا بـێ، هەر دەستەواژە و دەربڕینێکی چاك و تازەت گوێ لێبێ، یان بیخوێنیەوە تێیدا تۆمـاری بکەی، ئەگەر ماناشیانت نەزانی ئەوا بیاندۆزەوە، پاشان ئەزبەریان[١] بکەیت و بـۆ چـەند جارێك بەکاریان بێنیەوە، تا دەبن بەبەشێك لە وتەکانت.

هەوڵدە بەم ڕێگەیەوە هەر ڕۆژەی دەستەواژەیەکی نـوێ، یـان دێـڕە شـیعرێك زیـاد بکەی.

٢-ئاشنایی هەبون بە زاراوەکانی ئەو بابەتەی لەبارەیەوە دەدوێی، ڕۆڵێکی گـەورەی لە قبوڵکردنی پەیامەکەت و ڕێزگرتنی وتەکانت دەبینێ، بەتایبـەتی لـەلای پسپۆڕانی بابەتەکەتدا.

٣-قەوارەی ئەو قسانەی مەبەستە بیانکەی دیاری بکە و نـەهێندە کورتێکـی واتـا شکێن بێ، نەهێندەش درێژدادڕێکی بێزارکەر بێ.

کاتێکی گونجاو بۆ قسەکردنەکەت هەڵبژێرە، چونکە لەوانەیـە هـەڵبژاردنی کـاتێکی نەگونجاو ببێتە هۆی ڕەتکردنەوەی وتەکانت لەلایەن ئەو کەسەی دەیدوێنـی. بزانـە هـەر قسەیەك جێ و ڕێی خۆی هەیە و هەر حاڵەتێکیش شـێوازێ دەخـوازێ، کـە جیایـە لـە شێوازی حاڵەتەکانی تر.

٤-ڕونی و ئاشکرایی لە قسەکردندا هۆیەکی گرنگە بـۆ ئـەوەی وا لـە بەرامبەرەکـە بکات لەگەڵ وتەکاندا کارلێك بکات. بەڵام ئەگەر وتەکان لێڵ و نارون و تەلیسماوی بـن

---

١ ئەزبەر: لەبەر، حفظ.

کەسانی تر کارلێکی لەگەڵدا ناکەن.

٥-گرێتی دەنگ و کـــارلێککردنی لەگـەڵ واتـای وشـەکاندا، یەکێکـە لـە ڕێگایـە گرنکەکانی گەیاندنی پەیام بە کەسانی تردا. ڕەنگـە یـەك جـۆرە قسـە لـە دوو کەسـی جیاوازەوە ببیستی و لەگەڵ یەکێکیان کارلێك بکەیت و کارت تێبکا و ئەوپەڕی گـــوڕ و تینت ببزوێنێ، کەچی ئەوەکەی تر موێکیشت نەبزوێنێ.

چەند تۆژەرێك لە بەریتانیا لە ساڵی ١٩٧٠دا لە بارەی کاریگەریەکانی قسە لەســەر کەسانی تردا کۆمەڵێك تۆژینەوەیان ئەنجام دا، بۆیان دەرکەوت، کە وشە و دەستەواژەکان (٧٠٪) و گرێتی دەنگ (٣٨٪) و گوزارشـــتەکانی جەســتەش وەکـو جولـەکانی چـاو و ڕوخسار و دەست و لەشیش (٥٥٪)ن، پاشان لە بارەی دوایینیانەوە بەدرێژتر دەدوێین.

## هەندێ لە خراپییەکانی پەیوەندی پێکردن بەهۆی قسەوە:

١-قسەکردن بەخێراییەکی زۆر وادەکات گوێگرەکە لە وتەکانی قسەکەرەکە نـەگات، شێوەی قسەکردنی ڕەوانبێژی پێغەمبەر ﷺ وابوە کە ئەگـەر یـەکێك مەبەسـتی بوایـە دەیتوانی ژمارەی وشەی قسەکانیشی بژمێرێت، گەلێ جار قسەکانی سێبارە کردۆتەوە تا خەڵك چاکتر تێ بگەن.

٢-منگە منگ و ناڕونی دەستەواژەکان.

٣-قسەکردن بەیەك جۆرە ئاواز بۆ هەمو حاڵەتەکانی وەکو پێکەنین و خۆشی و گریان و خەم و خوێنگەرمی و هێمنی، کە ئەمە خراپترین نەنگیە لە قسەکردندا.

٤-نغرۆبون لە بەکارهێنانی ئیدیۆم و مەجاز[1] و درێژەدان بەجۆرێکی وا کە نـــاواخنی قســـەکان لـەبیربکرێ و گوێگـر نـەزانێ باسـی چ بابـەتێکی بـۆ دەکـرێ، یـا تەنانــەت قسەکەرەکە خۆیشی لەبیری بچێتەوە، کـە باسـی چ بابـەتێك دەکـات و لـە گوێگرەکـە بپرسێ: ئەرێ بابەتەکە چ بو، کە باسمان لێوە دەکرد؟

## چۆن پەرە بە شێوازی قسەکردنت دەدەیت؟

١-بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی سەرکەوتوانە بتوانی‌توانای قسەکردن وەدەسـت بخـەی، زۆر چاك گوێ بگرە ئەو قسەکەرە بەنێوبانگانەی، کە توانای کاریگەریەکی گەورەیان لەســـەر

---

[1] ئیدیۆم: کنایة، باسکردنی شتێك بە پێچ و پەنا. مەجاز: واتە گوڕی، خوازە، خواستە.

گوێگران هەیە، هەوڵدە لە سەرەتادا لاسایان بکەیتەوە، پاشـان ڕێگایـەکی دیـاریکراوی تایبەت بەخۆت هەڵبژێرە.

٢-داوا لە هەندێ کەسانی دەوروبەرت بکە قسەکانت تۆمار بکـەن بێئـەوەی خـۆت ئاگادار بی، پاشان گوێبیستی خۆت ببەوە و شێوازی قسە کردنەکەت تاووتوێ بکە و لـە کەسانی تر داوا بکە هەڵیسەنگێنن.

٣-دوای هەر جارێك کە وەسەر مینبەر کەوتی، هەوڵدە ئەو تێبینیانەی کە لە بارەی قسەکانتەوە درکی پێ دەکەی، تۆماریان بکەیت و لە وتەکانی داهاتوتدا هەڵیانبوێری.

## دەربڕین بەبێ قسەکردن:

وەك چۆن قسەکردن کەرەستەیەکە بـۆ دەربڕیـن و گـەیاندنی پـەیامێك، کەرەسـتەی تریش هەن کە بتوانن پەیامێك بەکەسانی تر، یان بەتۆ بگەینن. ڕەنگە ئـەم کەرەسـتانە وردەکارتر و ڕاستگۆ تریش بن، وەك لە دەربڕین بە قسەکردن. چونکە ڕەنگـە قسـەکردن پێچەوانە بێ لەگەڵ واقیعدا، بەڵام لە ئەوانی تردا ڕەنگە مـرۆڤ نـەتوانێ درۆیـان تێـدا بکات.

عەرەب لە مێـژە گوتویانـە: (ڕەنگـە ئامـاژە کاریگـەرترین دەسـتەواژە بـێ). جـا دەربڕینەکە رەنگە بەهۆی دەستەکان، یان چاوەکان، یان لۆچی روخسار، یان جوڵەی شـان و لاق و سەرەوە بێ، یان ڕەنگە بەهۆی حاڵەتێکی دەرونیەوە بێ لە میانەی لەبـەرکردنی جلوبەرگەکەتدا.

فەرمو لەگەڵ درێژە باسی هەندێ لەم کەرەستانەدا:

## زمانی چاو:

خوا فەرمویەتی:

﴿فَإِذَا جَاءَ الْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَالَّذِي يُغْشَى عَلَيْـــهِ مِـــنَ الْمَوْتِ: هەرگا ترسێ دێتە پێشێ، دەیانبینی هەر زەق لـــەتۆ دەڕوانــن و چاویــان سـپی هەڵدەگەڕێ؛ وەك یەکێ لەترسی مردن بێهۆش بوبێ.﴾الاحزاب/١٩.

شاعیریش گوتویەتی:

إن العيون لتبدي في نواظرها  ما في القلوب من البغضاء والإحن

شاعیرێکی تریش گوتویەتی:

العین تبدي الذي في قلب صاحبها — من الشناءة أو حب إذا کانا
إن البغیض له عین یصدقها — لا یستطیع لما في القلوب کتمانا
فالعین تنطق والأفواه صامتة — حتی تری من صمیم القلب تبیانا

بەڵێ، چاوەکان هەر بریتی نین لە ئامرازێك، تا جیهانی دەرەوەی پێ ببینرێ، بەڵکو ئامرازێکی کاریگەریشن بۆ گوزارشت کردن لە ناواخنی دڵ و دەرون و گەیاندنی بە جیهانی دەرەوە.

تەماشاکردن هەیە دودڵ و شڵەژاوە، هەیە هاناخواز و بەزیو و دابەزیوە، هەیە بە ڕق و کینە و تۆڵەسێنە، هەیە گاڵتەجارە، هەیە تەمای کردنی کارێکی هەیە، هەیە سوکەڵە و بێ ئەمیەتە، هەیە فام وەرگرە، هەشە خۆشەویستە... ئا بەم جۆرە، تەماشاکردنەکان فرەجۆرن لە دەربڕین و گوزارشت کردندا. قورئانی پیرۆزیش هەندێ جۆرە تەماشاکردنی بە (خائنة الأعین: چاوی ناپاك) ناودێر کردوە.

مرۆڤ وەك ئامرازێك بۆ دەربڕینی نێو دەرونی خۆی و تێگەیشتن لە نێو دەرونی کەسانی تر دەتوانێ رەفتار لەگەڵ زمانی چاوان بکات و شتیان لێ بخوێنێتەوە.

## باشترین دەربڕین بە چاو:

ئەگەر ویستت مەبەستەکانت بەهۆی چاوەکانتەوە دەربڕی، ئەوا لەسەر ئەم مەسەلانە مکوڕبە:

١-با چاوەکانت لەکاتی قسەکردندا مورتاح بن و ئەو هەستە بۆ بەرامبەرەکەت دروست ببێ، کە لێت دڵنیا بێ و متمانەی لەلادا دروست ببێ لەمەڕ حاڵەت و دروستی بیر و بۆچونەکانت.

٢-کە قسەی لەگەڵدا دەکەی با سەرت بەرەو سەرەوە بڵند بێ، چونکە سەرنەوی کردن لە کاتی قسەکردندا لاوازی و بەزیوی و زەبونی پەیدا دەکات.

٣-لە کاتی قسەکردندا تەماشای دوری دوێنەرەکەت مەکە و چاو لە ئاسمان هەڵمەبڕە و لە زەویش دامەگرە، چونکە ئەم جۆرە تەماشاکردنانە هەستی بایەخ نەدان بە دوێنەر، یان بەو بابەتەی کە لە بارەیەوە دەدوێی پەیدا دەکات.

٤-هێندە چاو مەبڕە چاوی ئەو کەسەی لەگەڵی دەدوێی بیشڵەژێنی.

٥-لەکاتی قسەکردندا وریابە لە زۆر داخستن و کردنەوەی پێڵوی چاوەکانت، چونکە هەستی دودڵی و پەشێوی پەیدا دەکات.
٦-عەینەکی رەشی تاریك لەچاو مەکە، کە لەگەڵ کەسانی تر دەدوێی، چونکە دەبێتە بەربەست لەبەردەم بیناکردنی متمانەی نێوانتان.
٧-وریابە لە تەماشا گاڵتەجارِ و ساردەکان بەرامبەر بەو کەسەی کە دەیدوێنی، یان دەتدوێنێ. چونکە دەبێتە تێکشکاندنی پردی لێك تێگەیشتن و متمانەی نێوانتان و گوڕ و تینی نامێنێ لەگەڵت بەردەوام بێ.

## چۆن لە میانەی تەماشای چاوەکانیەوە لە ناواخنی دەرون دەگەیت؟

زانایانی دەروناسی گەلێ ئەزمونیان ئەنجام داوە، تا بەهۆی واتا بەخشیەکانی چاوەوە لە ناواخنی دەرونان بگەن.

رەحمەتی خوا لە ئیبنولقەییم، کە گوتویەتی: چاوەکان پەیکی[1] دڵانن بەهۆیانەوە نێو دڵان وەدەردەکەون ئەگەرچی خاوەن دڵان هیچ شتێکیش نەدرکێنن.

هەندێ لەو ئەنجامانەی پێی گەیشتون هەروەك دکتۆر محمدی تکریتی لە کتێبەکەیدا بەناوی (آفات بلا حدود)دا باسی دەکات- ئەوەیە: کە ئەگەر لە کاتی قسەکردندا تەماشای لاچەپی سەرەوەی کرد، واتا ئەم مرۆڤە گوزارشت لە وێنەیەکی ناو یادگەکەی دەکات. ئەگەر قسەشی دەکرد، چاوەکانی بەرەو لای راستی سەرەوە خزەی دەکرد، ئەوا لە پێکهێنان و سازدانی چەند وێنەیەکی ناوەکی دایە کە پێشتر نەیدیوە. بەڵام ئەگەر چاوەکانی ڕاستەوخۆ بەرەو لای چەپ ئاڕاستە دەبون، ئەوا وتەیەك بەبیر خۆی دێنێتەوە کە پێشتر بیستویەتی. ئەگەر تەماشاکردنەکەی ڕاستەوخۆ بەرەو لای ڕاست بو، ئەوا وتەیەك پێکدێنێ کە پێشتر نەیبیستوە. ئەگەر تەماشای لای ڕاستی خوارەوەی دەکرد، ئەوا لەبارەی هەستە ناوەکیەکانیەوە دەدوێ، ئەگەر تەماشای لای چەپی خوارەوەی دەکرد، ئەوا گوێ دەگرێتە خۆی و لەگەڵ خۆی دەدوێ، بۆ نمونە وەك ئەو کەسەی شتێك لەگەڵ خۆی دەخوێنێتەوە.

ئەمانە لە حاڵەتی مرۆڤە ئاساییەکاندا وان، بەڵام مرۆڤە سەرسەختەکان تەواو بە پێچەوانەوەیە.

---

١ پەیك: نامەبەر

بەپێی ئەم زانیاریانە دەتوانی جۆری ستایلی[1] قسەی دوێنەرەکەت دیاری بکەی، بەڵکو دەتوانی لەو کاتەی چامەیەك[2] یان پارچە پەخشانێك دەخوێنێتەوە، ئەو ستایلە دەستنیشان بکەی کە خوێنەرەکەی لە کاتی ئامادەکرنیدا تێیدا دەژیا، کە ئایا ستایلەکە بیستەنی (سمعي)، یان وێنەیی نێو یادگەکەی بوە، یا ئەوە بوە کە پێکی هێناوە، یان پێکهێنەری وێنە بوە، یان پێکهێنەری هەستە ناوەکیەکان بوە؟.

ئەمانەش بەمەوە دەزانرێن کە لە وتەکانی وردبیتەوە و بەگوێرەی پۆلێنەکانی پێشو پۆلێن بکرێت.

## دەربڕین بە ڕوخسار:

مرۆڤ هەروەك چۆن دەتوانێ بەهۆی چاوەکانیەوە مەبەستەکانی دەربڕێ و بەهۆی وردبونەوە، لە تەماشای چاوی کەسانی ترەوە لە ناواخنی دەرونیان بگات، بە هەمان شێوە دەشتوانی بەهۆی لۆچەکانی روخسارەوە هەمان خوێندنەوە وەدەست بێنێ، جا بەهۆی لۆچەکانی روخسارەوە بێ، یان بەهۆی شێوەی لچ و لێو و حاڵەتی ڕومەتەکان و نێوچەوانەوە بێ.

فەرمو لەگەڵ مندا کەمێك لەم ئایەتە پیرۆزانە رامێنە کە خوای گەورە فەرمویەتی:

﴿**وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ**: هەرکاتێ مژدەی کچێ بۆ یەکێك لەمانە بچێ، روخساری ڕەش هەڵدەگەرێ و لەبەر خۆی پێش دەخواتەوە.﴾النحل/٥٨.

﴿**تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنْكَرَ**: لە چرچاوی خودانەناسەکاندا نیشانەی حاشا دەبینی.﴾الحج/٧٢.

﴿**كَأَنَّمَا أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِنَ اللَّيْلِ مُظْلِمًا**: ئێژی ڕویان چەند بەتلێك لە تاریکەشەو داپۆشیون.﴾یونس/٢٧.

جا لەبەر ئەوەی ڕوگرژی و ڕو وشکی و ترشی دەبێتە مایەی کۆسپ و تەگەرە خستنەوە لە نێوان تۆ و کەسانی تردا، بۆیە پێویستە بزانی چۆن کۆنترۆڵی بیروبۆچون و

---

١ ستایل: چەشن، جۆر، نمط.

٢ چامە: قصیدة

هەستەکانت دەکەیت، تا ئەو کات ڕوگرژیەکەت مەبەستدار و کۆنترۆڵ کراو بێ، لەکاتی گونجاویشدا پەیامی دیاریکراوی خۆی بگەیەنێ.

دیمەنەکانی روگرژی زۆربەی جاران لەوە دەردەکەون، کە نێوچەوان دێتەوە یەك و ڕومەتەکان دەبنەوە و دانەکان جیڕدەبنەوە و وشك هەڵدەگەڕێن و پێستی ڕوخساریش ڕەش هەڵدەگەڕێ.

بەشێوەیەکی گشتی ئەمانەی خوارەوە هەندێ بیروبۆچونی گشتین لەبارەی مەسەلەی مەبەست دەربڕین بەهۆی لۆچەکانی ڕوخسارەوە:

١-زەردەخەنە بکە پەیکی دڵان، چونکە بریتیە لە کلیلی دەرگاکانی دەرون و ئارامی و مورتاحیت پێدەبەخشێ. (زەردەخەنەت بەڕوی براکەتدا چاکەیەکە).[١]

٢-ئەگەر هەستت کرد دەرگای گوێکانت لەڕوو داخراوە و ئامێری وەرگرتنی پەیامەکەت لە کار کەتوە، ئەوا کەشوهەواکە بەنوکتەیەك بڕازێنەوە، کە ببێتە مایەی زەردەخەنە.

٣-خۆت لە زەردەخەنەی سارد و گاڵتەئامێز بپارێزە، چونکە سارد و سڕی و بێ متمانەیی لە نێوان تۆ و کەسانی تر پەیدا دەکات.

٤-هەوڵدە بەهۆی زەردەخەنە و شێوەی نێوچەوان و جوڵەی چاوەکانەوە لە ناواخنی دەرونی بەرامبەرەکەت بگەیت.

٥-خۆت وا ڕابینە کە گوێ بگریە تەنزە پێکەنیناویەکان، تا ناوەناوە لەسەر پێکەنین ڕابێت.

## گوزارشت کردن بەهۆی ئەندامەکانی تری جەستەوە:

وەك چۆن روخسار دەربری ناواخنی دەرونە، جولەکانی دەست و پێ و شان و چۆنیەتی دانیشتن و رۆیشتنیش بەهەمان شێوە گوزارشت لە ناواخنی دەرونی مرۆڤ دەکەن و راپۆرتیکی ورد لە بارەی حالەتی دەرونەوە پیشکەش دەکەن. هەندێ لە شیوەکانی گوزارشت کردن بەدەست ئەمانەن:

١-ئەگەر یەکێك دەستەکانی خستبێتە دیوی پشتی و پەنجەکانی تێك پەراندبێ، واتای ئەوەیە کە هەست بە دەستەوسانی خۆی، یا بێ متمانەیی لە کەسانی تر دەکات.

---

١ عن ابيذر قال: قال رسول اللهﷺ: (تبسمك في وجه أخيك صدقة). رواه الترمذي. حديث مرفوع.

٢-بەڵام ئەگەر یەکێك دانیشتبێ و دەستەکانی خۆی لەبەردەمدا تێك پەڕاندبێ، واتای ئەوەیە کە هەست بە بڕوا بەخۆبونێکی زیاد لە پێویست دەکات و گوێ بەکەسانی تریش نادات.

٣-ئاماژەی دەست و پەنجەکان کە هاوسازن لەگەڵ قسەکردندا، ڕونکردنەوەیەکی پتر بە قسەکەوە دەبەخشن. عەرەب گوتویانە: ڕەنگە ئاماژە کاریگەرتر بێ لە دەستەواژە.

٤-تێبینی جوڵەی پێی کەسانی تر بکە لەو کاتەی لەگەڵیان دەدوێی، چونکە گوزارشت لە ناواخنی دەرونیان دەکات، هەروەها خۆشت لەو کاتەی لەگەڵ یەکێك دەدوێی کۆنترۆڵی جوڵەی پێیەکانت بکە، ئەگەر مەبەستت نیە بەهۆی جوڵەکانەوە پەیامێك ڕاگەیەنی.

٥-هەژاندنەوەی شانەکان بۆ سەرەوە بەخێرایی واتای خۆ نەبان[1] کردن و گوێ پێنەدان، یان نەزانین و داماوی لەمەڕ شتێك دەگەیەنێ.

## چۆن وادەکەی بە جلوبەرگەوە ڕێزت بگرن؟

جۆری جلوبەرگ ڕەنگە کار بکاتە سەر دەرونی خودی کەسەکەوە، هەروەها ئامرازێکیشە بۆ ئەوەی مۆرکسازیەکی[2] سەرەتایی دیاریکراو بەکەسانی تر لەبارەی کەسەکەوە ببەخشێ. چونکە جل و بەرگ دەربڕی بەها و نەفسیەتی کەسەکەیە. جلوبەرگ مۆرکسازیەکەی لەڕێی ڕەنگ و سادەیی و پێکەو سازان و نەرمونیانیەکەیەوە لەلای کەسانی ترەوە دروست دەکات. جا گرنگترین ئەو ڕێسایانەی کە پێویستە پەیڕەویان لێ بکرێ ئەمانەن:

١-پێویستە جلوبەرگەکە پابەندی ڕێکخەرە شەرعیەکان بێ، جا پیاو بێ یان ئافرەت، ئەم ڕێکخەرانەش لە کتێبە فیقهیەکان باسکراون.

٢-ئاگاداری ئەوەبە کە جلوبەرگەکەت لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە قبوڵکراوە بێ، چونکە ڕەنگە شەرعی بێ، بەڵام لە ڕوی کۆمەڵایەتیەوە ناقبوڵ بێ، وەك ئەو کەسەی کە لە کۆمەڵگەیەکی بیابان نشیندا، کە جگە لە کراسی شۆڕ چیتریان نەدیبێ؛ سور بێ (بەدلە) لەبەر بکات.

---

١ خۆ نەبان: تجاهل.

٢ مۆرکسازی: انطباع.

٣-بۆ ئەوەی جلوبەرگەکەت هەم بۆ خۆت و هەم بۆ خەڵکیش مایەی موورتاحی بن، هەمیشە پاکوخاوێنیەکەی بپارێزە.
٤-خۆ کەشخەکردنێکی لە سنور؛ ڕێزی کەسانی تر وەدەست دێنیّ.
٥-سادەیی و خۆبارنەکردن[1] نیشانەی زەوقی پێگەیشتون.
٦-ڕەچاوکردنی کات و شوێن نابێ لەبیر بکرێ، بۆ نمونە جلی هاوینە جیاوازە لەگەڵ جلی زستانە، جلی ڕۆژی ژن گواستنەوە جیاوازە لە جلی ڕۆژی سەیران.

## چاك گویّ گرتن:

چاك گوێگرتن یەکێکە لەو دوو پایەی، کە گەیاندنی سەرکەوتوی لەسەر وەستاوە، هەر هێندە بەس نیە کە لە ناردنی پەیامەکەتدا سەرکەوتن وەدەست بێنی، بەڵکو دەبێ لە وەرگرتنی پەیامی بەرامبەرەکەشت سەرکەوتن وەدەست بێنی و کاردانەوەکانی بگرێتە خۆ، لە مەبەستەکانی بگەیت و سودی لیّ وەرگری، یان کاری تێبکەی و بەچاکی ئاراستەی بکەن.

وێڕای ئەمانە گوێڕادێرانی چاك دابێکە لە دابە هەرە بەرزەکانی ڕەفتارکردنی ئەو مرۆڤانەی کە نەجیمزادەن و سەرکەوتنیان وەدەست هێناوە لە خۆبەڕێوەبردن و خۆ کۆنترۆڵکردندا، هەروەها کارامەییەکی پێشکەوتوی مرۆڤانەیە، بۆ فێربون و دەستخستنی زانست و زانیاریش ناکرێ لێی دەستبەردار بین. توێژینەوەکان دەریان خستوە، کە ڕێژەی تێگەیشتن لە وتەکانی بەرامبەر ڕاستەوخۆ دوای تەواوبونی لە نێوان ٤٠٪ تا ٧٥٪ دایە. گەورەترین هۆی جیاوازی ئەم ڕێژەیەش بریتیە لە جیاوازی نێوان گوێڕادێران و گوێگرتن، گرنگترین کەرەستەکانی گوێڕادێرانیش بریتین لە:
١-گوێگرتن بە گویّ.
٢-تەماشاکردن بەچاو.
٣-ئاگاداربون و تەرکیزکردن بە دڵ و عەقڵ.

## ئاسەوارەکانی گوێنەگرتنی چاك:

١-چاك گوێنەگرتن ڕەنگە ببێتە مایەی بێبەشبونت لە متمانە و ڕێزی خەڵك. کاتێك

---

[1] خۆبارنەکردن: عدم التکلف.

یەکێ لەگەڵت دەدوێ، تۆش خۆت بە تەلەفۆن، یان بە قسەکردنت لەگەڵ تەنیشتەکەت، یان بە نوسینی لاپەڕەکانت خەریك دەکەی، توشی دڵساردیی دەکەی و متمانەی خۆت لە لایدا ون دەکەی. لە ئەحنەفیان گێڕاوەتەوە، کە گوتویەتی: ((پیاو هەیە هەندێ مەسەلەم بۆ باس دەکات من بەر لە دایکبونی ئەودا دەیانزانم، بەڵام گوێشی بۆ ڕادەدێرم، تا لە وتەکانی تەواو دەکا، وا نیشان دەدەم، کە من یەکەم جارە دەیانبیستم)).

٢-تێنەگەیشتن لە مەبەستی کەسانی تر و دوا تریش فەشەل هێنان لە ڕەفتارکردن لەگەڵیاندا، چونکە لە ڕەفتار کردن لەگەڵ دۆست و دوژمندا، وا دەخوازێ لە مەبەستەکانیان بگەی، تێگەیشتن لە مەبەست و مرازەکانیش هەر بەهۆی گوێگرتن و تەرکیز کردنەوە دەبێ.

٣-لە دەستدانی زۆر لە هەل و دەرفەتەکان، کە دەبنە مایەی سەرکەوتن لە ژیاندا، چونکە دەرفەتەکان لە ئەنجامی تێکەڵبون لەگەڵ کەسانی تر و تێگەیشتن لە مەبەست و نیاز و مەرامەکانیانەوە پەیدا دەبن. جا ئەگەر مرۆڤ لە گوێ گرتن فەشەلی هێنا، ئەوا لە تێگەیشتنیان فەشەل دێنێ، دواتریش زۆر لە دەرفەتەکان لە دەست دەدات.

٤-ڕانەهاتن لەسەر وەرگرتنی زانیاریەکان بەشێوەیەکی پوخت و مانەوەی زانیاریەکان بە کەم و کورتی لە لای ئەو کەسەی، کە بەباشی گوێ ڕاناگرێ و واش تێدەگات، کە زانیاریەکانی تەواو و بێ کەمایەتین.

٥-بەهەڵە بڕیاردان بەهۆی کەم و کورتی زانیاریەکان، چونکە هیچ بڕیارێك ڕاست و دروست دەرناچێ، ئەگەر زانیاری تەواو و ڕاست و دروستی لەگەڵدا نەبێ.

٦-دوێنەرەکە بەهۆی گوێ بۆ نەگرتنیەوە توشی دڵساردی دەبێ، دواتریش ئامادەیی نابێ بۆ ئەوەی بەشداریەکی چالاکانە لەو کردەوانە بکات، کە پێی ڕادەسپێردرێ.

## بێدەنگی و گوێگرتن و گوێڕادێرانی چاك:

بۆ ئەوەی کارامەیی و گوێگرتنێکی چاك و گوێڕادێرانێکی باش بەدەست بخەی و بەروبومی ئەو کارە بدوریەوە، دەبێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەبەرچاو بگری:

١-لەو کاتەی گوێ لە کەسێ ڕادەگری لە بارێکی دەرونی و جەستەیی مورتاح دا بیت و هیچ نەخۆشیەکی بەئێشت نەبێ، یان شەونخونیەکی داهێزت نەکێشابێ، یان برسیەتی زۆریی بۆ نەهێنابیت.

ڕاستەوخۆ دوای نانخواردن نەبێ، یان لە میانەی خەریکبونت بەکارێکەوە نەبێ، کە بیرکردنەوەی خستبیە ژێر رکێفەوە، هەروەها لە شوێنێکی هەواساز و پلەی گەرمی

سرەوتنامێزیش[1] دابیت.

٢-هیچ ژاوەژاو و دەنگە دەنگی بێزارکەر لە شوێنی دانیشتنەکەت، یا لەدەوروبەریدا نەبێت، چونکە دەبێتە هۆی پەرت و بڵاوەبونی زەین و هەستەکانیش، سەرقاڵ دەبن.

٣-دانیشتنەکەت لەکاتی گوێگرتندا بەشێوەیەکی سرەوتامێزی وابێ، کـە بتوانیـبە هەمو هەستەکانەوە تەرکیز لەسەر دوێنەرەکە بکەیت، تـا بـەڵکو بتوانـی لـە زۆرتریـن بەشی وتەکانی بگەیت.

٤-ئەو شتانەی گوێبیستی دەبی لەگەڵ ئەو وێنە و دیمەنانەی دەیـانبینی گـرێ بـدە، تاوەکو بیستن و بینین بەهاریکاری یەکتریەوە زانیاریەکان وەرگرن.

٥-چاوبڕە جولەکانی جەستەی دوێنەر و گوزارشتی ڕوخسار و تۆنی دەنگەکـەی، تـا بەڵکو واتای وتەکانی لە دڵ و دەرونتدا ڕەگاژۆ ببێ و بە وردتر لە مەبەستەکانی بگەی.

٦-دانیشتنەکە لە ڕاددەی وەرگرتن و تێگەیشتنت درێژتر مەکەوە و بەشەکەی تر بـۆ کاتێکی تر هەڵگرە. چونکە کە دەرون بێزار بو شەنگی لەبەر دەبڕێ.

٧-قسە بە دوێنەرەکە مەبڕە و بە پەلە مەبە بۆ ئەنجامەکان بەر لـەوەی ئـەو پێیـان بگات، ئەگەر تێگەیشتنەکە شێواویەکیشی بەخۆوە بینی لەلای خـۆت تۆمـاری بکـە و پاشان، کە لە وتەکانی بوەوە داوای ڕونکردنەوە بکە.

٨-لەکاتی وتوێژدا زۆر ئاوڕ بەملا و ئەولادا مەدەوە و باوشێکێکی زۆرت نەیەتەوە و داڵغەت نەڕوات و بیرت بەلایەکی تردا نەڕوات.

٩-لە دوێنەرەکە بترازێ لەگەڵ کەسی تر مەدوێ، مەگەر بۆ زەرورەت. باشتریش وایە ڕوخسەتێکی لێ بخوازی.

١٠-قەڵەم و کاغەز بگرە دەست، تاوەکو ئەو بیروبۆچونە سەرەکی و خاڵـە وردانـەی کە لە دوێنەرەوە گوێبیستی دەبی، پوختیان بکەیتەوە و لە لای خۆتەوە تۆماریان بکەی. پاشان هەوڵدە لەبەریان بکەیت، تا زانیـاریت لـە بـارەی بابـەتی وتوێژەکـەوە بمێنـێ و زانیاریەکان بپارێزی.

* * *

---

[1] سرەوتنامێز: مریح.

# بەربەستەکانی پەیوەندی پێکردن

هەندێ کاروبار هەن بەچاوپۆشی لە جۆرێتیان دەبنــە بەربەست لەبـەردەم پـەیوەندی پێکردنەوە، هەیانە لە نێرەرەکەیەوەیە و هەیانە لــە وەرگرەوەیــە، هەشـیانە ڕەنگـە لــە پەیامەکەوە بێت. من لێرەدا کۆمــەڵێکیان بـاس دەکـەم و پاشـان بـەدرێژی لـە بـارەی هەریەکەیانەوە دەدوێم:

١-ڕون نەبونی ئامانجی پەیامەکە.

٢-هەڵـەی نـێرەر لـە پێشـبینی کردنـی جـۆری کاردانـەوەی وەرگرەکـە و، توانـای تێگەیشتنی لە پەیامەکە.

٣-راگەیاندنی پەیامەکە بە لێڵی و هەڵەیی.

٤-جێبەجێکردنی پرۆسەی پەیوەندی پێکردنەکە لە کاتێکی نەگونجاودا.

٥-فەشەل هێنان لە بەکارهێنانی هەڵنەر و حەز بزوێنەکان، یان لە گرێدانــی بابـەتی پەیامەکە پێیانەوە.

٦-چاك گوێ نەگرتن و گرنگی نەدان بە پەیامەکە.

٧-بەهەڵە راڤەکردنی پەیامەکە و بەڕاست و دروست لێ تێنەگەیشتنی.

٨-دەسپێشخەریکردن لە وەڵامدانەوەی پەیامەکە بەر لەوەی تاوتوێ بکرێ.

٩-شەرمێك کە ببێتەمایەی لەتوانا خسـتنی نێرەرەکـە لـە گـەیاندنی بـە ڕاسـت و دروستی پەیامەکەی ڕاگەیەنێ. فەرمو لەگەڵ درێژەی باسی ئەم بەربەستە:

## شەرمندەیی یەکێکە لە بەربەستەکانی پەیوەندی پێکردنەوە:

شەرمـندە بەشێوەیەکی گشتی بریتیە لە هەستکردن بە پەشۆکی و شڵەژاوی لە کـاتی ڕوبەروبونەوە لەگەڵ خەڵکدا. شەرم و شەرمندە دوشتی جیاوازن.

شەرمـندە ئەو هەستکردن بە گرژبونەوە و پەشۆکانەیە، کـە لـە ئـەنجامی کـردن، یـا باسکردنی کردەیەکی بێڕەزاوە پەیدا دەبێ. بـەم پێودانــە شــەرمندە ناپەســندە و شــەرم پەسند.

**هەندێ لە دیاردەکانی شەرمندەیی:**

١-گرژبونی دەمارە هەستەکیەکان لە کاتی دیدەنی کەسانی تردا.

٢-زمان تێك ئاڵان و نەمانی توانای لێ تێگەیشتنیان.

٣-شلەژانی ئەندامەکانی لەش و سورهەڵگەڕانی ڕوخسار.
٤-بڕوا بەخۆنەبون لە دەسپێکردنی گەلێ لە کارەکان لە ئامادەبونی کەسانی ترەوە.

## چارەسەری نەخۆشی شەرمندەیی:

١-لە ڕوی کۆمەڵایەتیەوە تێکەڵ بە کۆمەڵێ لە برادەران، یان دراوسێکان، یان خزمان ببە و بەشداری لە چالاکیەکان وەکو گەشت و بۆنەکانیان بکە.

٢-جارجارە بڕۆ بەشداری لەگەڵ گروپێکی وەرزشواندا بکە.

٣-جاروبار چەند نوکتەیەکی پێکەنیناوی بۆ برادەرەکانت بگێڕەوە و لە پێکەنیندا بەشدارییان لەگەڵدا بکە.

٤-هەوڵدە لەگەڵ پێکەنینیدا چەند کەسێ لەوانەی لە هەندێ بۆنەی، وەکو ناو فرۆکە و ئامانەدا دەیانبینی یەکتر بناسن و وتوویژیان لەگەڵدا بکە و بیربۆچونیان بناسە.

٥-لەکاتی ڕانواندنی بیروبۆچونەکانت هەوڵدە خۆت وا بێنیە بەرچاو، کە تەنها لەگەڵ خۆت دەدوێیت و هیچ کەسێکت لەبەرامبەر نیە.

٦-هەمیشە نوێژەکانت لە مزگەوتێ بە کۆمەڵ بکە، ئەگەر دەرفەتت بۆ هەڵکەوت پێشنوێژیش بکە بەتایبەتی لە نوێژە بەدەنگەکاندا.

٧-هەوڵدە لەو بابەتانەی کە خۆت تیایدا باڵا دەستی، کەسانی تریش بەشداری پێبکەی لە قسەکاندا.

٨-ئەگەر هەستت بە گرژیی دەمارە هەستیەکانت کرد، ئەوا هەوڵدە ئیسراحەتێ بکەی و پاشان بگەڕێیتەوە نێو کۆڕەکەوە.

٩-بەر لەوەی ڕوبەڕوی خەڵك ببیەوە پلانێك بۆ وشە و کردەوەکانت دارێژە و پێشبینی کاردانەوەی وەرگرەکە بکە و، بەپێی ئەم بنەمایەوە پلانەکەت دەستکاری بکە و هەوڵدە پتر لە جارێك مەشق لەسەر وتەکانت بکەی، پاشان ڕاستەوخۆ پلانەکەت بەوپەڕی ڕێز و ڕاستگۆییەوە جێبەجێ بکە، ئەگەر ئەم کارانەت بۆ چەند جارێك دوبارە کردەوە، ئەوا بەیاریدەی خواوە شەرمەکەت دەڕوات.

١٠-بگەڕێوە سەر جێباسی (چۆن بڕوا بەخۆبون دێنیە دی). لەوێدا چارەسەرێکی گشتیانە بەدی دەکەی بۆ نەهێشتنی ئەم بەربەستە و بەربەستی تر.

❊ ❊ ❊

# بنیاتنانی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی تردا

قسە کـردن دەربـارەی پـەیوەندی پێکـردن و پێکـەوەبون لەگـەڵ کەسـانی تـردا و، کارتێکردنیان و سود وەرگرتن لەو شتانەی کە لەلای واندا هەیە، وا پێویست دەکات لـە بارەی هونەری بنیاتنـانی پـەیوەندی لەگـەڵ کەسـانی تـر و شـێوازەکانی موجامەلـە و لێوەشاوەیی لە رەفتارکرندا بدوێین. جا ئەمانەی خوارەوە بریتین لە گرنگترین ئەو یاسـا و رێسایانەی، کە پێویستە لە بنیاتنانی پەیوەندیەکاندا لەگەڵ خەڵکی پەیڕەویان لێ بکرێ:

١-نێوانی خۆت و خوا چاك بکە خواش نێوانی تۆ و خەڵکان چـاك دەکـات. چونکـە دڵەکان بەدەستی خواوەن و خوا چۆنی بوێ ئاوا ڕویان وەردەگێڕێ، هـەر خـوا پێکـەنین و گریان دێنێتە ئاراوە.

﴿فَإِنَّ حَسْبَكَ اللَّهُ هُوَ الَّذِي أَيَّدَكَ بِنَصْرِهِ وَبِالْمُؤْمِنِينَ، وَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ لَوْ أَنفَقْتَ مَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مَا أَلَّفْتَ بَيْنَ قُلُوبِهِمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ أَلَّفَ بَيْنَهُمْ إِنَّهُ عَزِيـــزٌ حَكِيـــمٌ: بەستە کە خودات دەگەڵە، هەر ئەویش هاتە هاواری خۆت و خاوەن بـاوەڕان و یـاریدەی دان. بەدڵ وانی کردە هۆگری یەکتری، ئەگەر هەرچی لەم سەر زەمینەدا هەیە، هـەموت بەخت بکردایە، نەتدەتوانی وا لێکیان کۆبکەیتەوە، بـەڵام خـودا وا لێکـی کـردوون بـە هۆگر، هەر خۆی خاوەن دەسەڵاتی لەکارزانە.﴾الانفال/٦٢-٦٣.

٢-توێژینەوەکانی دەروناسی سـەلماندویانە، کـە هـەر مرۆڤێـك جـۆرە سـتایلێکی[١] تایبەت بەخۆی هەیە. ستایلەکانیش بەشێوەیەکی گشتی یا ستایلی وێنەیین، واتە مرۆڤ لە میانەی وێنەکانەوە لـە جیـهان دەڕوانـێ و ڕەفتـاری لەگـەڵدا دەکـات، یـا سـتایلی بیستەنین واتە مرۆڤ لە ڕێی وشە بیستراوەکانەوە لە جیهان دەڕوانێ و ڕەفتاری لەگـەڵدا دەکات، یانیش سـتایلی هەسـتەکین، واتـا لـە ڕێـی هەسـتە ناوەکیەکانیـەوە لەجیـهان دەڕوانێ.

ناسینی ستایلی ئەو مرۆڤەی کە ڕەفتاری لەگـەڵدا دەکـەیت و هـەوڵدانت بـۆ چونـە ژورەوە لە ڕێی ئەم ستایلەوە؛ دەبێتە مایەی هاوسازی و هەماهەنگی نێوانتان و متمانـە

---

١ ستایل: چەشن، جۆر، نمط

و باوەڕیتان لە بەیندا پەیدا دەبێ. دوای کەمێکی تر بەیاریدەی خواوە پتر لە بارەی ئەم بابەتەوە دەدوێین.

٣-خۆت لە شوێنی کەسانی ترەوە دانێ و پاشان ئەو وتانەیان گوێبیست بکە، کە خۆت حەزت لێیە گوێ بیستیان بیت و بەو جۆرە هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکە، کە خۆت پێت خۆشە وا هەڵسوکەوتت لەگەڵدا بکرێ.

٤-هەمیشە زەردەخەنە لەسەر لێوان بێ بەتایبەتی لە حاڵەتە سەخت و ڕوداوە ترسناکەکاندا.

٥-لەو حاڵەتەی کە دەمارت دەگرن هێمنی خۆت بپارێزە و تورەیی خۆت دامرکێنەوە و ئامۆژگاریەکەی پێغەمبەر ﷺ بەبیر خۆت بخەوە، کە دەفەرموێ: (( **لاتغضب**، **لاتغضب**، **لاتغضب**: تورە مەبە، تورە مەبە، تورە مەبە)).

٦-حیساب بۆ هەست و ماف و پێویستیەکانی کەسانی تر بکە و ئەم فەرمایشتەی خوا بەبیرخۆت بێنەوە، کە دەفەرموێ: ﴿**وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ**: ئەگەر یەکێ دڵڕەق و توند و تۆسن بای، بڵاوەیان لێ دەکردی﴾ال عمران/١٥٩.

٧-وشەکانت بە وردی هەڵبژێرە بەتایبەتی لە یەکەم دیداردا، کە وشەکانیشت دەردەبڕی با بەشێوەیەکی گەش و شادیەوە بێ. خۆت لە ڕەق و وشکی لۆچەکانی ڕوخسار و ڕوگرژی بپارێزە، ئەگەر چی وشەکانت لە شنەبای بەیانیانیش نەرم و نیانتر بێ.

و إذا نظرت لي أسرة وجهه          برقت كبرق العارض المتهلل

٨-ئەگەر کەش و هەواکە نەگونجاو بێ بۆ قسەکردن لە بارەی بابەتێکی دیاریکراوەوە، ئەوا بە سەنگینیەوە کۆتایی بە وتووێژەکە بێنە و بۆ کاتێکی گونجاوتری هەڵگرە.

٩-ئاخاوتنەکەت بە نوکتە و تەنز و نمونەی خۆش خۆش برازێنەوە، بەڵام با لە سنوری خۆی تێنەپەڕێ و لە شتی ناڕاست وەدور بێ، چونکە بەم شێوەیە جۆرە کارلێکێك لە ئاخاوتنەکەدا دروست دەبێ.

١٠-دیاریەکی جوان ئەگەر چی بچوکیش بێ، هەروەها زووزوو یارمەتیدانی خەڵکی، دو هۆکاری هەرە گرنگن بۆ کەمەندکێش کردنی دڵان و بیناکردنی پەیوەندی لە نێوان

خەڵكدا. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ((تهادوا تحابوا: دیاری بەیەكتری ببەخشن، لەلای یەكتر خۆشەویست دەبن)).

١١-سڵاوكردن و سڵاودانەوەی باشتر كلیلی دڵانن، هەوڵدە ببیە خاوەنی ئەم كلیلە و وەكو هەندێ لەو خەڵكانە مەبە، كە ئەگەر سڵاویان لێ بكرێ بە سەیروسەمەرەوە لێیان بڕوانێ و لە دڵی خۆی بڵێ خۆ من نایانناسم و نامناسن!

١٢-ڕاستگۆیی بەجێگەیاندنی بەڵێن وا لە خەڵك دەكەن تۆیان لەلادا خۆشەویست بێ ئەگەر چی لە تواناشت نەبێ مەبەستەكانیان بێنیە دی. هیچ سیفەتێكی خراپتر نیە لە درۆكردن و دەستخەڕۆكردنی خەڵك.

درۆ وا لە مرۆڤ دەكات هیچ سەنگ و باوەڕیەكی لەلای خەڵك نەمێنێ. لەبیرمەكە كە درۆ ڕێگەی بەدكاری و ئاگرە و سیفەتی دوڕوانە. خوا بمانپارێزێ.

١٣-بەخشندەیی بەپێی توانا ئەگەرچی كەمیش بێ؛ وا دەكا بەرزترین پایەت لەدڵی خەڵك بۆ دیار بكات. مرۆڤ هەرگیز ناتوانێ لەلای خەڵك خۆشەویست بێ، ئەگەر سیفەتی چروكی و پیسكەیی هەبێ. ﴿وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ: كەسانێك خۆ لە ڕژی دەپارێزن، ئەوانە ڕزگارەكانن.﴾الحشر/٩.

١٤-سادەیی و خۆبارنەكردن لە ڕەفتاركردندا، لەگەڵ ڕێكوپێكخستنی كاروبارەكانی ژیان و دوركەوتنەوە لە بێسەروبەری، لە لای خەڵك بەڕێزت دەكەن، ئەگەر چی دوژمنیشت بن.

١٥-پاك و خاوێنی جلوبەرگ و لەش و لار و دەم و ددان و خۆ كەشخەكردنی لە سنور و بۆنخۆشی، دەبنە مایەی مورتاحبونی ئەو كەسانەی ڕەفتارت لەگەڵدا دەكەن و لێت دورناكەونەوە.

* * *

# پۆلێنكردنی خەڵك

مرۆڤ بە گشتی لە پێكهاتەیەكی تێكەڵ و ئاڵۆزی سۆز و عـەقلانیبون و خودێتـی و بابەتێتی و ناوەكی و دەرەكی و وریابون و جورئـەت و لێبـوردن و دڵرەقـی و بەخشـین و نەبەخشین و بەرز و باڵایی و نوچخواردن و لە گەلێك هەڵنەری تری لەگـەڵ یـەك سـاز و ناسازی تری مرۆڤانەیی پێك هاتوە.

چەند هۆكارێكی ئاڵۆزتر هەن كە كار لە كەم و زیادی رێژەی ئەم سیفەتانە دەكەن بـۆ نمونە: بۆماوە، پەروەردە، كارتێكەرە ژینگەییەكان، سیستەمە بیروباوەڕیەكان، بەهاكان، نەریتـە كۆمەڵایەتیـەكان، ئاسـتی رۆشـنبیری و مـــەعریفی، شـــارەزایی و ئەزمونـــە پراكتیكیەكان، بارودۆخی ئابوری و حاڵەتی ئاسایشی كەسەكە، گەلێ هۆكـاری تـر كـە نایەنە ژماردن.

ئەو پۆلێنكردنەی كە من لێرەدا دەیخەمـــە ڕوو، واتـای ئـەوە ناگەیـەنێ كـە هـەمو خەڵكی تەنها بەسەر ئەم پۆلێنانە دابەش بن، چونكە ڕەنگە خەڵكی وا هەبن نەچنە ژێـر ئەم پۆلێنكاریە و ڕێژە و كایری سیفەتەكانیان، ڕەنگە ئەو سیفەتانەی من دەیانخەمە ڕوو جیاواز بن.

## أ-عەقلانیە كۆمەڵایەتیە وێنەییەكان.

كە گرنگترین سیفەتەكانیان ئەمانەن:

١-لە میانەی وێنە و بینینی چاوەكانەوە لە جیهان دەڕوانێ، تەنانەت لـەو كاتانـەی باس لە واتا ڕووتەكانیش دەكرێت، ئەو هەر دەیانگۆڕێ بۆ چەند وێنەیەكی بینراو.

٢-حەز بە پەیوەندیكردن دەكات لەگەڵ كەسانی تر و لە پێداویستیەكانیان دەگات.

٣-لەكاتی ئاخاوتندا خێرایە لەبەر ئەوەی كـارتێكراوە بـە سـتایلی وێنەییـەوە، كـە لەسەر وێنە یەك لە دوا یەكەكان و ڕوناكیەوە بەندە.

٤-حەساسیەتێكی لە رادده بەدەری نیە و لەم ڕوەوە بێ چەند و چۆنە.

٥-گرنگی بە وردەكاریەكان دەدات و بە گرفتە ڕۆژانەییەكانەوە خەریك دەبێ.

٦-تواناى تێکەڵبونى هەیە لەگەڵ خەڵکانى تر و دەتوانێ ڕێز و متمانەیان وەدەست بێنێ.
٧-پێى باشترە لە ڕۆژدا کاربکات و کارەکەش بەئاشکرایى لەبەر چاوى خەڵکەوە بێ.
٨-بەکەڵکى کارە تاکییەکان نایەت و ئارامیان لەسەر ناگرێ.
٩-چێژ لەکارە کۆمەڵیەکانەوە وەردەگرێ و شتى نوێ دێنێتە ئاراوە.
١٠-سەخاوەتى هەیە و زو متمانە بەخەڵکى دەکات.

## ب-عەقلانیە گرمۆڵەییە بیستەنییەکان.

کە گرنگترین سیفەتەکانیان ئەمانەن:
١-گرنگیەکى زۆر بە هەڵبژاردنى واژە[1] و دەستەواژەکان دەدات.
٢-ئاخاوتنەکەى هێدى و لەسەرخۆیە و لەکاتى ئاخاوتنىدا تەرکیز دەکاتە سەر تۆنى دەنگى.
٣-زۆر حەز بە گوێگرتن دەکات.
٤-زۆر حەز بە واتا ڕوتە تیۆرییەکان دەکات.
٥-حەز بەتەنیایى دەکات و ڕقى لە ژاوەژاو و هەرا و هۆریایە.
٦-توانایەکى سنوردارى هەیە لە بنیاتنانى پەیوەندى بەستن لەگەڵ کەسانى تر و تێکەڵبون لە کارە کۆمەڵییەکان.
٧-لە ڕاددە بەدەر حیساب بۆ هەر کارێك دەکات، کە پێى رادەسپێردرێ و حەز لە سەرچڵى[2] و کارە حیساب بۆ نەکراوەکان ناکات.
٨-لە کارەکانى توێژینەوە و پلان دانانیدا سەرکەوتن دێنێ، چونکە ئەم کارانە پێویستیان بە لێبڕاوەیى و ئارامى و ژمارەیەکى کەم لە بەشداربوان هەیە.
٩-بەهێزەوە ئەو شتانە دەردەبڕێ کە بڕواى پێ هەن و وا گریمان دەکات، کە بەر لە ئاخاوتنەکەیدا خەڵکەکە دان بە لۆجیکەکەى ئەو دادەنێن.

---

١ واژە: لفظ
٢ سەرچڵى: مغامرة

١٠-لە میانەی وشە و زمانەوە لە جیهان دەڕوانێ، تەنانەت ئەگەر بیەوێ گوزارشت لە وێنەیەکی بینراوی بێگیانیش بکات، ئەو دەیکاتە قسەکەرێکی ئاخێوەرێ گوزارشتکەر.

## ج-سۆزئامێزە گرمۆڵەییە هەستئامێزەکان.

کە گرنگترین سیفەتەکانیان ئەمانەن:

١-ئاخاوتنەکەی لە هی پێشتر هێدی ترە.

٢-دەنگەکەی لە قوڵاییەوە بە ئاه و ئاخ هەڵکێشان، یان بە هەناسەیەکی قوڵەوە دەردێنێ.

٣-پتر لە کەسانی تر هەست بە باری بەرپرسێتی دەکات، بۆیە بۆ ڕێبیرەکان هەڵدەچێ و بۆ کارکردنی لە پێناویان هەڵدەچێ.

٤-کە رووبەرووی یەکێك دەبێتەوە شەرم و دودڵی بەسەردا زاڵ دەبێ و، لە کاردا ڕقی لە نوێخوازی و سەرچڵی دەبێتەوە و حەز بە گۆڕینی کارەکەی ناکات.

٥-هەمیشە لە تواناکانی خۆی بە گومانە.

٦-حەز بە پەیوەندیکردن لەگەڵ خەڵك ناکات و ئەگەر لەگەڵیشیان تێکەڵ بێ تووڕە و توندە و بە کەمترین هۆ هەڵدەچێ، بەڵام جاروبار نەبێ ئەگینا وەدەری ناخات.

٧-لەو حاڵەتانەی بە تەنیا دەمێنێتەوە، یا لەگەڵ چەند کەسێکدا دەبێ، کارەکانی خەڵك دەخاتە بەر تیغی ڕەخنە و توێکاریەوە.

٨-لە سەرکردایەتیکردنی کەسانی تر سەرکەوتن ناهێنێ و، لە ڕواڵەتدا وا دەردەکەوێ بە ئاسانی بەر فەرمان دەبێ، بەڵام لە ناوەوە تا سەر ئێسقان کینە و بێزاری لەو کەسە دەردەبڕێ کە ئاڕاستەی دەکات.

## د-سۆزئامێزی کۆمەڵایەتی.

کە گرنگترین سیفەتەکانی ئەمانەن:

١-بەردەوام لە جموجۆڵ و چالاکی تازە و نوێ دایە.

٢-خاوەنی مگێزێکی[1] گۆڕاوە و لەسەر شتێ جێگیر نابێ.

٣-لە دەربڕینی خۆشەویستی و ڕق و کینەدا زۆر توند و تیژە و پێدا هەڵگوتن و ڕەخنەکانیشی لە ڕاددەبەدەرن و، لە حوکمەکانیشیدا بابەتیانە نین.

٤-بۆ کاری سەرکردایەتی، یان درێژخان ناگونجێ، بەڵام بۆ کارە کورت و نزیکەکان دەگونجێ.

٥-لە بزواندنی کەش و هەوای مەنگ و مردو خاوەنی داهێنانە، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت.

٦-لە بنیاتنانی پەیوەندیە درێژخایەنە هەمیشەییەکان سەرکەوتن ناهێنێ، بەڵام لە پەیوەندیە کورت خایەنەکان بەتایبەتی لەگەڵ ئەوانەی، کە رۆشنبیریەکی کەمیان هەیە و خاوەن تەماحن.

٧-بەزۆرینەیی لە دەربڕینی وتەکانیدا ڕاستگۆیە و ڕاستەوخۆ بیروبۆچونەکان دەخاتە ڕو و لە درکە و ماناپۆشیدا کارامە نیە.

٨-بەرگەی تەنیایی ناگرێ و تەنیابون لەگەڵ ئەودا ناگونجێ، هەروەها سەرکەوتنیش ناهێنێ کە بەتەنیایی و بەهێمنی ئەنجام دەدرێن.

وەکو پێشتر باسم کرد بەپێی سەلماندنەکانی توێژینەوە دەرونیەکان؛ خەڵك بە زۆرینەیی بەسەر ئەم ستایلانەدا دابەش دەبن. بەڵام ڕەنگە ستایلی تریش هەبن، ڕەنگە مرۆڤ هەبێ سۆزنامێزێکی گرمۆڵەیی بیستەنی بێ، ڕەنگە عەقلنامێزێکی کۆمەڵانی هەستەکی، یان بیستەنی یان جۆرێکی تر بێ لە پێکهاتەی سیفەتە جیاوازەکانی تر. مرۆڤی کامڵ دەگمەنە و هەمو مرۆڤێکیش سیفەتی سلبی و ئیجابی تێدایە. بۆیە تۆ کە ڕەفتار لەگەڵ کەسانی تر دەکەی دەبێ لە سەرەتادا ئەوە دیار بکەی، کە لە چ جۆرە ستایلێکدایە، ئینجا گرنگترین سیفەتەکانی لەبەرچاو بگری، پاشان پلانێك داڕێژە بۆ ڕەفتارکردنت لەگەڵیدا.

مرۆڤ بەهۆی هەوڵدان و ئارامگرتنەوە بەرێی چەندین شێواز و ڕێگەی جۆراوجۆرەوە، کە لێرەدا بواری درێژەپێدان نیە، دەتوانێ زیاتر لەیەك جۆرە ستایلی دەرونی لەخۆی کۆ

---

[1] مگێز: میزاج.

بکاتەوە، دواتریش دەتوانێ زۆربەی سیفەتە ئیجابیەکانی پتر لە ستایلیك وەدەست بخات و خۆشی لە سیفەتە سلبیەکانی ستایلە تایبەتیەکەی خۆی رزگار بکات.

هەروەها دەتوانێ کەسانی تر پەروەردە و پاکخو(تهذیب) بکات، تا ئەوەی لی بیتەدی کە باسم کرد، بەڵام بە کۆشش و خۆراگریەکی گەورەتر.

جا هەر پرۆسەی پەروەردە و پاکخویی کردنە، ك خەلکی لەنیوان یەکتری پێ جیاکار دەکرێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿والذین جاهدوا فینا لنهدینهم سبلنا: ئەوانەی لەرای ئیمەدا چونە خەزا، ئیمەش ئەوان بەریگای خۆماندا دەبەین.﴾العنکبوت/٦٩.

هەروا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ: لەوانیشدا چەند کەسێکمان کردە رێبەر، کە هەر بە فەرمانی خۆمان رێنوێنی مەردم بکەن؛ چونکە توانای خۆڕاگرتنیان تێدابو، بەتەواوی باوەڕیشیان بە نیشانانمان هێنابو.﴾السجدة/٢٤.

❊ ❊ ❊

# چەند هەڵوەستەیەك لە بارەی کێشەکانی کارەوە

مرۆڤ ناتوانێ بێکار بێ و هەر دەبێ بە کارێکەوە خەریك بێ، جا یان بەچاکە یانیش بە خراپە. ژیان هەر چەندە مەوداکەی کورتە، بەڵام بریتیە لە گۆڕەپانی کێبەرکێی ڕاستەقینەی نێوان تاك و نەتەوان.

ژیریش ئەو کەسەیە کە پەی بەم هەقیقەتە دەبات و زوو وەخۆ دەکەوێ، تا سود لە ژیان وەرگرێ و هەوڵەکانیشی دەخاتە پێناوی باشترین و بەبەرهەمترین کار و بە پێشکەوتوترین و بە بەروبومترین شێواز هەنگاوەکانی هەڵدەگرێ.

جا کارەکە ڕەنگە فەرمانبەرێتی بێ، ڕەنگە پیشەیەك بێ، ڕەنگە بازرگانی و کارە ئازادەکانی تر بێ.

هەر کارێك مەرجی سەرکەوتنی تایبەت بەخۆی هەیە، بەڵام پێشی ئەم مەرجانەش کۆمەڵە ئاڕاستەکارییەکی گشتی هەن لە بارەی کێشەکانی کاردا، پێویستە پەیڕەویان لێ بکرێ و ڕەچاو بکرێن، تاکو سەرکەوتن بە باڵای کارەکەدا ببڕێ، کە ئەمانەن:

١-لەهەر شوێنێ بوی ترسی خوات لەدڵ بێ و حەڵاڵ نەبێ نەیخۆی، هەمیشە لەبیرت بێ ئەو گۆشتەی بە حەرام لە لەشت گەشە دەکات شایەن بە ئاگرە. بۆیە با کارەکەت ڕێپێدراو و دور لە حەرام بێ و بە ڕاستگۆیی و دەسپاکیشەوە ئەنجامی بدە.

٢-وریابە کات بەفیڕۆ نەدەی، چونکە کات بەفیڕۆدان، واتە فەشەل هێنان لە کارەکەتدا، جا هەر کارێ بێ.

٣-بەهۆی کارکردنەوە خەم و دودڵی و شڵەژانیەکەت بکوژە، کارکردن ئەو دەرمانە سەرکەوتوەیە، کە هەمو کەس دەتوانێ بەکاری بێنێ، بەڵام هەندێك لە خەڵکی بەکاری دێنن.

٤-خۆت نەخەیتە بەر ئەرکێکی لەتوانا بەدەر، یان کارێك نەکەی کە شارەزای نەبیت. کەواتە یان ناوی خوا لەو ئیشە دێنی، کە لێی دەزانی و توانات هەیە بیکەی یانیش، هەوڵ دەدەی خۆتی بۆ ئامادە بکەی و توانا خوازراوەکان بەردەست بخەیت بەر لەوەی ڕوبکەیتە کارەکە.

٥-لەگەڵ ڕوداو و خەڵکا بە نەرم و نیانیەوە رەفتار بکە مادەم مەسەلەکە نابێتە مایەی بێشەرعی، یان ئەنجامێکی گردەبڕ[١] و چارەنوسسازانەی لێ ناکەوێتەوە. لەگەڵ خەڵك و روداو و حاڵەتەکاندا بە نەرم و نیانی و ژیهاتیەوە[٢] بجولێوە، هیچ بەربەستێکیش لەوەدانیە کە ئەگەر کارەکەت رابگری، یان هەنگاوێك بچیتە دواوە بە مەبەستی خۆ سازدانت بۆ ئەوەی چەند هەنگاوێکی تر بەرەو پێشەوە هەڵێنی.

ئەمەش وات لەسەر پێویست دەکا، کە خاوەنی ڕەوشتی چاك و لێکدانەوەی ژیربێژیانە بیت و لە رەفتارکردنەکەت لەگەڵ خەڵکیدا وشەکانت بە چاکی هەڵبژێری.

٦-لەو ڕوداوانەی دێنە پێشت، یان کە بەدیداری خەڵك دەگەی خۆت وا رامەهێنە زوو حوکمیان بەسەردا دەرکەیت و مەکەوە بەر کاریگەری مۆرکسازیە سەرەتاکانت، بەڵکو ڕێگەی لەسەرخۆیی و تێوەڕوانی[٣] پەیڕەو بکە و زانیاریەکان کۆ بکەوە و هەڵوێست و وشەکان شی بکەوە ئەنجا حوکمەکەت دەرکە.

٧-لەوانەیە لە ژیاندا گەلێ جار لەبەردەم کۆمەڵێك هەڵبژاردنی جیاواز، یان لەبەردەم ترازگەیەکی[٤] هەمە چەشن و ڕەنگە یەکلاکەرەوەش بوەستی. ئا لەم حاڵەتەدا پێویستە بیر لە چارەنوس و ئەنجامەکان بکەیتەوە و سود و زیانی هەر یەك لە هەڵبژاردنەکان لە تەرازو بدەیت و پاشان حاڵەتەکە یەکلابکەیتەوە. دوای ئەوەی پشت بە خواوە دەبەستی و بەرێی ڕەواوە پەیوەستی؛ ناوی خوای لێ بێنی و ئەم هەڵبژاردنەی یەکلات کردۆتەوە هەنگاوی بۆ هەڵگری.

٨-گرنگی بە گەشەپێکردن و پەرەپێدانی تواناکان و سود وەرگرتن لە دەستکەوتە زانستی و ژیارییەکان بدە، بۆ پێشخستنی کارەکانت و زیاترکردنی بەرهەم و باشترکردنی ئەنجامەکانت، ئەمەش بەوە دەکرێ کە مەشق بکەیت و بخوێنیەوە و لە کۆڕ و خولەکاندا ئامادە بیت و ئاگاداری هەمو شتە تازەکانت بیت، کە دێنە ئاراوە و پەیوەندیان بە

---

١ گردەبڕ: حاسم.
٢ ژیهات: عاقلانە
٣ تێوەڕوان: متأمل.
٤ ترازگە: مفترق الطرق.

کارەکەتەوە هەیە، بۆ نمونە وەك: کۆمپیوتەر، تەلەفۆن، فاکس، سیستەمی زانیاریـەکان، مەڵبەندەکانی تۆژینەوە، ساختومانە مەشقییەکان و گەلێکی تر.

٩-زۆر وریابە کارەکانت دوا نەخەیت و بەسەر یەکەوە کەڵەکەیان نەکەی و یـەك بـە یەك بەدەستوبرد ئەنجامیان بدە و بەبێ دودڵیەوە ڕوبەڕوی بەرپرسێتیەکان ببەوە و بۆیـان دەست بەکاربە، چونکە ئەمە مەرجێکی سەرکەوتنە بۆ هەرکارێك کە بتەوێ بیکەی.

١٠-ڕەنگە لە کارەکەتدا لەناکاوێ ڕەوشێکی هەڵەت بێتە ڕێ، بەڵام توشی دڵساردی و بێهومێدی و ئەژنۆشکاوی مەبە، بەڵکو هەرزوو هەوڵدە بە سـەلامەتترین و هێمنـترین ڕێگا چاکی بکەیتەوە.

❊ ❊ ❊

# مەرجەکانی سەرکەوتنی فەرمانبەریتی

فەرمانبەریتی یەکێکە لەو جۆرە کارانەی، کە زۆربەی خەڵك پێوەی خەریکن، جا لە دام و دەزگا حکومییەکان بێت یان لە کۆمپانیا گشتیەکان، یانیش لە ساختومانە[1] تایبەتیەکان بێت، لێرەدا چەند مەرجێك هەن کە پێویستە بێنەدی، تا فەرمانبەریتیەکە سەرکەوتو بێ، کە ئەمانەن:

١-لەگەڵ خۆتا دوپات بکەوە کە ئایا لەگەڵ کارە فەرمانبەریەکەتدا هاوسازیت، یان ئارەزو و حەزت لێی هەیە، چونکە لە هەر کارێکدا ئەگەر هاوسازی و حەز و ئارەزوی لەگەڵدا نەبێ، ئەوا مرۆڤ ناتوانێ لە فەرمانبەریتیەکەدا سەرکەوتو بێ.

٢-دەبێ کارامەییەکی پێویست هەبێ بۆ بەڕێوەبردنی کارەکە لە کەمترین ئاستی داواکراودا. هەمو کارێك چەند تایبەتمەندیەکی خۆی هەیە وا لەسەر ئەو کەسە پێویست دەکا، کە بە ئەنجامدانی کارەکە هەڵدەستێ؛ شارەزاییەکی تەواوی لە بارەیانەوە هەبێ، یەکەم جار لە ڕوی تیۆریەوە، دوەمجار لەڕوی مەشق و ڕاهێنانەوە.

٣-سود لە شارەزایی و لێزانینی کەسانی لەخۆت کۆنتر وەرگرە، ئەگەرچی خوێندەواریشیان کەمتر و بڕوانامەشیان نزمتر بێ، چونکە شارەزایی پراکتیکی[2] ئەوپەڕی بایەخی هەیە لە کاردا.

٤-لەو گرفتانەی دێنە پێشت ڕاوێژ بە سەرۆکەکەت بکە و مەودای پێشکەوتنت لە کارەکەدا بخە بەردەمی، ڕاوبۆچونەکانی بەهەند هەڵگرە، با هەمیشە مەوعیدی دیاریکراوت لەگەڵیدا هەبێ.

٥-با دیدەنی ڕێکخراوی[3] ناوە ناوەییت هەبێ، لەگەڵ هاوکارەکانت، چ ئەوانەی سەرۆکن، چ ئەوانەش کەهەمان کار ئەنجام دەدەن، تا بتوانی کاروباری کارەکە بتۆژیەوە و لە گرفتەکانیان شارەزا بیت و لە چارەسەری گرفتەکاندا یارمەتیان بدەیت، هەروەها هانیان بدە و بیربۆچونی بنیاتنەرانەیان پێشکەش بکە و لە بنیاتنانەکەشدا یارمەتیان بدە.

---

١ ساختومان: مؤسسة.

٢ پراکتیکی: عملي

٣ دیدەنی ڕێکخراو: لقاءات منظمة.

٦-رۆژانـەی ئەرکـەکانی کـارە پیشـەییەکەت دابـەش بکـە، کـە لێـت خـوازراون جێبەجێیان بکەی. با دابەشـکردنەکەت نـەگۆڕ و هەمیشـەیی بێـت، تـا ئەوانـەی کـە ڕەفتارت لەگەڵدا دەکەن سودت لێ وەرگرن، بۆ نمونە دەتوانـی ڕۆژانـەی فەرمانبـەرێتیت بەسەر ئەم کاروبارانەوە دابەش بکەی:

کاتێك تەرخان بکەیت بۆ ڕانواندن[1] و توێژینـەوەی موعامـەلات و ڕاپۆرتـەکان، بـۆ نمونە با لە سەرەتای دەوامەوە بێت.

پاشان کات تەرخان بکەی بۆ موراجیعەکان -ئەوانـەی لـە دەرەوەی بەڕێوەبەرایـەتی دان ئەگەر کارەکەت ئـەم بەشـەی تێدابـو- بێنـە دیدەنیـت، پاشـان بـا بـۆ مـەوعیدی کۆبونەوەکان لەگەڵ فەرمانبەر و هاوکارانت یان پێشوازیکردنیان، یان بۆ دیدەنیەکان بێ لەگەڵ سەرۆکەکانت لە کارەکەدا، پاشان با بۆ وەڵامدانەوەی پەیوەندیە تەلەفۆنیەکان بێ، پاشان لە دوایین جاردا با کاتەکە بۆ سەردان و بەسەرکردنەوە مەیدانیـەکان بـێ، ئەگـەر کارەکە ئەم شتە بخوازێ.

لێرەدا مرۆڤ دەتوانێ لیستێك بەدەرگاکەیەوە هەڵواسێ، کە بەرنامە ڕۆژانەییەکـەی بە سەعات و دەقیقەوە دیاری کرابێ، تا بەڵکو هاوکارەکان بزانن لە چ کاتێکدا دەتوانن، یان ناتوانن سەردانی بکەن. ئەم نمونەیەی هێناومە شتێکی ئیلزامی نیە، چونکە ڕەنگـە لە کارێکەوە بۆ کارێکی تر جیاواز بێ.

٧-پسپۆڕان لە زانستی کارگێڕیدا دەڵێن: وردەکاری لە کار و گرنگیدان بـە درێـژە و چەند و چۆنەکانی و بەدواداچونی لەسەرەتاوە تا کۆتایی، بریتین لە سێکوچکەی پوختەیی لەکاری فەرمانبەرێتیدا، بەو مەرجەی هەرسێکیان بە هاوسەنگی وەرگری و هیچێکیـان فەرامۆش نەکەی یان لە سنوری تێنەپەڕێنی.

٨-تۆ ببە بەپێشەنگی هاوکارانت لە دەسپاکی و ڕاستگۆیی و دادپەروەری و پابـەند بون بەکاتی دەوامی ڕەسمـی، هـەروا جێبـەجێکردنی لائیحـە و سیسـتەمی دەزگاکـە و کارلێککردنی پۆزەتیڤانە لەگەڵیدا و پێشکەشکردنی پێشنیازی بنیاتنەرانە لەبارەیەوە.

* * *

---

[1] ڕانواندن: استعراض.

# کاربەخشینەوە لە ئیشی فەرمانبەرێتیدا

فەرمانبەری سەرکەوتو ئەو کەسەیە کە دەتوانێ گروپێکی کارا لە دەوری خۆی کۆکاتەوە، پاشان ڕوحی دەسپێشخەری و بەخشینیان لەنێودا پەرە پێبدا و کارامەیی و تواناکانیان گەشە پێ بکا و هەر تاکە و کارێکی شیاوی پێ بسپێرێ.

کاربەخشینەوە[1]، یەکێکە لەو پرەنسیپە[2] بنچینەییانەی، کە کەسێك بیەوێ لە فەرمانبەرێتیەکەدا سەرکەوتن وەدەست بێنێ.

پێچەوانەی ئەمەش بریتیە لە مەرکەزیەتێکی ئەوتۆ کە وزەکان لەکار دەخات و داهێنانەکان دەکوژێ. دەتوانین کاربەخشینەوە بەمجۆرە پێناسە بکەین: بریتیە لە سپاردنی چەند کارێك بە کەسانی ترەوە، کە لە ژێر سەرپەرشت و بەرپرسێتی خۆتدا بێت.

## سودەکانی کار بەخشینەوە:

١-سود وەرگرتن لە وزە و شارەزاییەکان و لەکار نەخستنیان.

٢-سوککردنی باری سەرشانی بەڕێوەبەر، یان سەرۆك و دابەشکردنی بەسەر کارکارانی دەوروبەری خۆی.

٣-خێرایی ئەنجامدانی کارەکە، چونکە ژمارەیەکی زۆرتر لە کارکاران تێیدا بەشدار دەبن.

٤-باشترێتی ئەنجامدانەکە، چونکە کارا بونی شارەزاییە تایبەتیەکان و سوککردنی باری قورس؛ زۆربەی کات دەبێتە مایەی پوختەیی لەکاردا.

٥-زۆری بەرهەم، چونکە تا ئەنجامدان خێراتر بێ ئەوا کاتە زیادەکان بۆ وەدیهێنانی دەستکەوتی تازە و نوێ بەکار دەبرێن و لە ئەنجامدا بەرهەم زۆر دەبێ.

---

١ کار بەخشینەوە: کار سپاردن، التفویض.

٢ پرەنسیپ: مبدأ .

## مەرجەکانی کاربەخشینەوەی سەرکەوتو:

١-دەبێ کار بەخشەرەوەکە دەسـرۆینەیی[1] هـەبێ لەکاربەخشـینەوەکەدا، ئەگـەر نـا کارەکەی سەرپێچیەکی دژ بە سیستەم و لائیحەکانی ئەو دەزگایە دەبێ، کە کاری تێـدا دەکات.

٢-دەبێ کارپێبەخشراوەکە حەز و ئارەزو و کارامـــەیی هـەبێ بـۆ ئـەنجامدانی ئـەو کارەی پێی سپێردراوە.

٣-دیاری کردنی سنوری کاربەخشینەوەکە بەوردی، لە ڕوی شوێن و کات و کەرەستە و دەستڕۆینەیی و دەسەلاّت و شتەکانی تریشدا.

٤-دیاریکردنی کـات و چۆنیـەتی پـەیوەندیکردنی نێـوان کاربەخشـەرەوە و کارپـێ بەخشراو. دەبێ پەیوەندی کردنەکەش بەسەر ئـەم ئەرکانـە دابـەش بـێ: سەرپەرشـتی و ئاڕاسـتەکردن و هەڵسـەنگاندن لەلایـەن بەرپرســەکەوە و داواکــاری و ڕونکردنــەوە و شرۆڤەکردنیش[2] لەلایەن کارپێ بەخشراوەکەوە.

٥-پەیوەندی نێوان هـەر دوو لایـەنی کاربەخشـینەوە، دەبـێ حاڵـەتی مامنـاوەندی وەرگرێ لە نێوان ئەو مەرکەزیەتەی، کـە کارپــێ بەخشـراوەکە هـەمو دەسـەلاّتێکی ون دەکات و ئەو لە کۆنترۆڵدەرچونەش، کە بەرپرسەکە مافی سەرپەرشـتی و بـەدواداچون و بەرپرسێتی ون دەکات.

* * *

---

١ دەسڕۆینەیی: صلاحیة .

٢ شرۆڤە: تەفسیر .

# کۆبونەوەکان لە کاردا

کۆبونەوە یەکێکــە لــەو کەرەســتە و ئــامرازە گرنگانــەی، کــە بەهۆیــەوە کاروبــارە ناتاکییەکانی پێ هەڵدەسورێ، جا کارەکە وەختەکی[1] بێ، یان بــەردەوام و هەمیشــەیی. هەندێ لە توێژینەوە تازەکان ئەوەیان دەرخستوە، کە لە نێــوان ٤٠٪ تــا ٧٥٪ی کــاتی کارەکان لە کۆبونەوەکاندا بەسەر دەچن.

کەچی بەرهەم و سودی کۆبونەوەکان بەرێژەی (٢٥٪)ـە. تۆش دەزانی کە کۆبونــەوە گرنکیەکی زۆری هەیە لە بەرێوەچونی کارەکاندا، کەچی زۆریشیان بە بێــهودەیی دەڕۆن. جا ئایا چۆن دەکرێ سود لە کۆبونەوەکان وەربگیرێت و سلبیاتەکانی وەدور خرێنــەوە؟.. لەم چەند دێڕەدا هەوڵدەدەین تیشکێك بخەینە سەر ئەم مەسەلەیە.

## سودەکانی کۆبونەوە:

١-بونی کۆبونەوە لــە هــەر دام و دەزگایــەکدا، یارمــەتی ئــاڵوگۆڕکردنی شــارەزایی دەدات لە نێوان ئیشکەرەکاندا.

٢-لەمیانــەی کۆبونــەوەکاندا، تــازەترین و ڕاســترین زانیــاری لــــە جێبــــاوەڕترین سەرچاوەوە پێشکەش بە بەرپرسان بە تایبەتی و، بە کرێکارانیش بەگشتی دەکرێت.

٣-هەل بەهەمو لایەکەوە دەدرێت تا بەشدار بن لە دەرکردنی بڕیارەکان، وێڕای گــوڕ و تین پەیدا کردن لە جێبەجێکردنیان و هەڵگرتنی بەرپرسێتیەکەیان.

٤-بەهۆی کۆبونەوەکانەوە ڕوحیەتی کۆمەڵکاری دێتە خرۆشین، کە بەتایبەتی لەکارە گەورەکاندا ناکرێ دەستبەرداری لەم ڕوحیەتە بکرێ.

## جۆرەکانی کۆبونەوە:

دەتوانین کۆبونەوەکانی هەر جۆرە کارێك بۆ چەند بەشێك دابەش بکەین، کە دەکــرێ لەمانەی خوارەوەدا پوختیان بکەینەوە:

---

[1] وەختەکی: مؤقت .

**١-كۆبونـەوەی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریەکان:** مەبەست لەم جۆرە کۆبونەوانەدا بریتیە لە ئاڵوگۆڕکردنێکی کۆمەڵێیانەی زانیاریەکان لە نێوان کرێکارەکاندا، کە بەم جۆرە کات و کۆششێکی زۆر دەگەڕێتەوە وەك لەوەی تەنیا تەنیا بێ.

**٢-کۆبونـەوەی دانـی بـڕیارەکان:** ئـەم جۆرەیـان لـەهی پێشـو جـیایە و لەم جۆرە کۆبونەوانـەدا ئـەو بابەتانـە دەخرێـنە بەرباس و تاوتوێکردنەوە، کە بڕیاریان لەبارەیەوە وەردەگرێت.

**٣-کۆبونـەوەی لێکۆڵینەوە و تۆژینەوەکان:** مەبەست لەم جۆرە کۆبونەوانەدا بریتیە لـە تۆژیـنەوە و لێکۆڵیـنەوە کـردن بـەهۆی تەوژمـێکی زەیـنی و هـزریەوە. لەم جۆرە کۆبونەوانەدا دەکرێ پتر لە گروپێکی کار پێکبهێنرێت، هەر گروپە و ئەرکی توێژینەوەی بابەتـێکی تایـبەت بـەخۆ، یـان بەشێك لە بابەتە گشتیەکەی لەبەر لێکۆڵینەوەدایە پێ بسپێردرێ.

**٤-کۆبونـەوە نائاسـاییەکان:** ئـەو کۆبونەوانە دەگرێتەوە کە پێویستیەکی لەناکاوی ناپێشبینیکراو و دیاری نەکراو لە پلانی دام و دەزگاکەدا دەیچەسپێنن.

**٥-کۆبونەوە رۆتینییە خولییەکان:** کە لە کارنامەی دام و دەزگاکەدا هەیە.

**٦-کۆبونـەوە ڕواڵەتـیە شێوەییە ئاهەنگییە پڕوپاگەندەییەکان:** کە ئەم جۆرانە بە کۆبونـەوە پرۆتۆکۆلـیەکان ناودێـر دەکـرێن. ئـەم جۆرەیـان لـە ئەوانی تر جیاوازن و بە پێچەوانەی ئەوانی ترەوە کۆبونەوەی بێ بەرهەمن.

**٧-کۆبونـەوە زانستیە فێرخوازیەکان:** ئـەو کۆبونەوانەن، کە قوتابییەکان چەند جۆرە زانستێك لەسەر دەستی مامۆستا و فێرکارەکانیانەوە فێر دەکرێن.

## کۆبونەوەی بەرهەمدار:

بـۆ ئەوەی کۆبونەوەکە بەرهەمدار و بە بەروبوم بێت و ئەوپەڕی سودی لێ وەربگیرێ، ئـەوا پێویسـتە ئامادەسـازیەکی چـاکی پێشـینە و هەڵسـوڕاندنێکی کارامـە و بەدواداچـونێکی پاشـینەیی وردی بـۆ بکـرێ، کەواتە بەم پێودانە دەتوانین فاکتەرەکانی سـەرکەوتن بکـەین بەسـێ بەشەوە: بەشێکیان بۆ قۆناغی ئامادەسازی و بەشێکی تریان لەکاتی کۆبونەوەکەدا، بەشەکەی تریان دوای کۆتایی هاتنی کۆبونەوەکە.

**فاکتەرەکانی سەرکەوتن لەکاتی ئامادەسازی کۆبونەوەکەدا (پێش کۆبونەوە):**

١-کۆبونەوەکە ئەنجام مەدە، ئەگەر هیچ شتێك پێویستی نەدەکرد، چونکە کات و کۆشش و توانستێکی زۆر بەفیڕۆ دەدات.

٢-پێویستە ئامانجەکانی کۆبونەوەکە بە ڕونی دیاری بکرێ، بەر لە بانگهێشتن بۆ کۆبونەوەکە.

٣-دەبێ بە ڕونی کات و شوێنی کۆبونەوەکە دیاری بکرێ، لەم دیاریکردنەدا پێویستە رەچاوی ئەوە بکرێ، کە لەگەڵ زۆرینەی بەشداربواندا بگونجێ.

٤-دەبێ ماوەیەك بەر لە کۆبونەوەکە کارنامەیەك بێتە ئامادەکردن، ئامادەکردنەکەش لە لایەن لێژنەی ئامادەسازی تایبەت بە کۆبونەوەکە یان لەلایەن دەستەی بەرپرسی کۆبونەوەکەوە بێت.

٥-خاڵێکی تری سەرکەوتنی کۆبونەوە لەوەدایە، کە ئامانج و کارنامە و شوێن و کاتی کۆبونەوەکە، یان هەندێ شتی تایبەتی بەبەشداربوان ڕابگەیەندرێ، ڕاگەیاندنەکەش بەماوەیەك بەر لە کۆبونەوەکە بێت تاکو ئامادەیی بۆ وەرگرن، هەر کۆبونەوەیەك کاتێکی ڕاگەیاندنی گونجاوی تایبەت بەخۆی هەیە.

٦-لایەنی ئامادەکاری کۆبونەوەکە لەسەریەتی پێداویستیەکانی وەکو پەڕ و پێنوس و ئاو و خۆراك و ئامێری رانواندن و دۆسیەی زانیاریەکان و ئامرازی گواستنەوە و شوێنی نوستن -ئەگەر درێژەی خایاند- و شتی هاوشێوە دابین بکات.

٧-بەرپرسی هەڵسوڕاندنی کۆبونەوەکە، دەبێ پلانێك بۆ کۆبونەوەکە دارێژێ، تا سەرکەوتن بێنێت.

٨-هەریەك لە بەشداربوانی کۆبونەوەکە، دەبێ لەڕوی دەرونی و جەستەیی و هزری و زانیاریەوە خۆی بۆ کۆبونەوەکە ئامادە بکات، لە کۆبونەوەکەشدا ڕەچاوی حاڵەتی دەرونی بەشداربوەکانی تر لەبەرچاو بگرێ و بزانێ چۆن رەفتاریان لەگەڵدا بکات.

**فاکتەرەکانی سەرکەوتن لەمیانەی کۆبونەوەکەدا:**

١-پابەندبونی گشت بانگهێشتراوان بە کات و شوێنی دیاریکراوی ئامادەبون لە کۆبونەوەکەدا.

٢-ئامادەبون لە کۆبونەوەکەدا بەو پەڕی چالاکی و جموجۆڵی و دور لە شەکەتیەوە.

٣-لەکاتی ئامادەبوندا سڵاوێکی ئیسلامیانە لە هەمویان بکرێ.

٤-کردنەوەی کۆبونەوەکە بە سوپاسکردنی خوا و درودوسڵاو ناردن بۆ پێغەمبەر ﷺ ، پاشان ئەگەر کرا چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بخوێندرێتەوە.

٥-پێناساندنی بەشداربوان ئەگەر پێشتر یەکتریان نەدەناسی و ڕونکردنەوەی ئەرکی هەریەك لە بەشداربوان.

٦-دیاریکردنی بەرپرس و بڕیاردەری کۆبونەوەکە، ئەگەر پێشتر ڕون نەکرابوەوە.

٧-یادخستنەوەی ئامادەبوان بە کارنامە و ریزبەندی رانواندن[1] و کاتی هەر بڕگەیەك لە بڕگەکانیشی ئەگەر کرا.

٨-دیاریکردنی کۆتایی کۆبونەوەکە، تا هەمو بەرچاویان ڕون بێ لەڕێوشوێنی کۆبونەوەکەدا.

٩-دەرفەتی وتوێژ و ئاخاوتن بەیەکسانی بدرێتە گشت بەشداربوان.

١٠-تا لەبارەی هەر بڕگەیەکی کارنامەکەوە بڕیارێکی ڕون و دیاریکراو نەدرێت، بڕگەیەکی تر نەخرێتە بەر لێکۆڵینەوە، بڕیارەکانیش هەموی یەك بەیەك بنوسرێنەوە. بڕیارەکان دەبێ بە هاودەنگی، یان بەزۆرینەی دەنگی بەشداربوانەوە بێ، یان بەپێی کارنامە و سیستەمی دەزگاکەوە بێت.

١١-هەر ئەندامێك لە بابەتی دیاریکراوی کۆبونەوەکە بچێتە دەرەوە ئاگادار بکرێتەوە، یان دوای بڕیار وەرگرتنەکە بێتە سەری و تەواوی بکات، لەوەش ئاگادار بکرێتەوە ئەگەر بوە مایەی ئازاردانی یەکێکی تر. با ئاگادار کردنەوەکە بەوپەڕی ڕێز و وشەی جوانەوە بێ.

---

[1] ڕیزبەندی: تسلسل. رانواندن: عرض .

١٢-لە کۆتایی کۆبونەوەکە بڕیار و ئەنجامە ساغکراوەکان و کارە تایبەتیەکانی هەر کەسێك ڕابگەیەنرێت.

١٣-کۆتایی هێنانی کۆبونەوەکە لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا و درێژ نەکردنەوەی، مەگەر لەحاڵەتی زەروریدا، یان بە ڕەزامەندی بەشداربوانەوە.

**فاکتەرەکانی سەرکەوتنی دوای کۆبونەوە:**

١-هەر ئەندامێك چ بڕیارێکی پێ تایبەت کراوە پێی ڕابگەیەندرێ.

٢-ڕاگەیاندنی ئەو لایەنانەی، کە لە کۆبونەوەکەدا ئامادە نەبوینە بەو شتانەی، کە بەپێی بڕیارەکانەوە لەسەریان پێویستە جێبەجێی بکەن.

٣-بەشداربوان بەڕێز و حورمەتەوە بەڕێ بکرێن.

٤-دارِشتنی پلانێکی جێبەجێکردنی بڕیارەکانی کۆبونەوەکە و، بەدواداچونیان و هەڵسەنگاندنی مەودای بەرەو پێشەوەچونی بەرەو وەدیهێنانی ئامانجی کۆبونەوەکە.

**هۆیەکانی سەرنەکەوتنی کۆبونەوەکان:**

١-نارِونی ئامانجی کۆبونەوەکان لەلای بەشداربوانەوە، یان قەناعەت پێ نەبونیان بە ئامانجەکە.

٢-نەبونی پلانێکی تەواو بۆ کۆبونەوەکە، لەڕوی هەڵسوڕاندن و دانانی کارنامە و دابینکردنی پێداویستیەکانەوە.

٣-بەشێوەیەکی باش کارنامە و ئامانج و شوێن و کاتی کۆبونەوەکە بەبەشداربوان ڕانەگەیەندرێ.

٤-ئامادەنەبونی بەشداربوان لە شوێن و کاتی دیاریکراودا.

٥-هەڵبژاردنی کاتی نەگونجاو یان کاتی وا کە تێرایی[1] کۆبونەوەکەوە نەکات.

٦-نەبونی شایستەیی بەشداربوان لە کۆبونەوەکەدا، جا یان بەهۆی شەکەتی جەستەیانەوە بێ، یان بەهۆی نەبونی قەناعەتەوە بێ، یانیش بەهۆی نەبونی زانیاری

---

١ تێرایی ناکات: بەشی ناکات .

تەواوە بێ، کە دەبنە مایەی کەم کردنەوەی توانا لە بەشداریکردنێکی چالاکانە و دەوڵەمەندکردنی بابەتەکانەوە.

٧-خەریکبون بە کاری بەدەر لە کارنامەکە لە کاتی کۆبونەوەکەدا؛ وەکو تەلەفۆن، یان زۆر چونە دەرەوە و هاتنە ژورەوە.

٨-نەگەیشتن بە بڕیاری دیاریکراوەوە لە بارەی بابەتەکانی کۆبونەوەکەدا، یان ڕون نەبونی بڕیارەکان لەلای بەشداربواندا.

٩-ڕوگرژی و دڵڕەقی یان جوێندان و فەرامۆشکردن لە هەڵسوڕاندنی کۆبونەوەکەدا.

١٠-نەبونی ڕاپەڕاندنی سەرکوتوانە و پڕ بە پێست بۆ ئەو بڕیارانەی، کە لە کۆبونەوەکاندا دەردەچێ.

※ ※ ※

## رێگاکانی بنیاتنانی متمانە لە نێوان خۆت و هاوکارانت لە کاردا

وێڕای ئەو شتانەی پێشتر لە بابەت بنیاتنانی پەیوەندی لەگەڵ کەسانی تـردا باسمـان کرد، کە بەشێوەیەکی گشتی چۆنیەتی رەفتارکردن لەگەل خەلکم رون کردۆتەوە بۆ ئەوەی باوەرییەکەیان وەدەست بهینرێ و پەیوەندییان لەگەڵدا ببەسترێ؛ هاوکـاران تایبەتمـەندی خۆیان هەیە لەبـەر ئـەوەی زۆر بەیەکـەوە دەبـن و پێویستیشـە پەیوەندیـەکی چاکیـان لەبەیندا هەبێ، تا کارەکەیان سەرکەوتو بێ. جا گرنگترین ئەو هەنگاوانەی کە پیویستە بۆ وەدیهینانی ئەم مەبەستە بیانگریە بەر ئەمانەن:

١-سور بە لەسەر کارەکەت و لە جیبەجێکردنی ئەرکەکاندا دەسپاك بە، تـا لـە لای هاوکارانت بەریز و سەنگین بیت.

٢-خاوەنی خورەوشتیکی بەرز و رەفتارێکی راستـەرێ بـە لـە رەفتـارکردنت لەگـەڵ هاوکارانت، روخۆش و دەم بەخەندە بە و زمانت پاك بێ، ئەوەی هەلەیەکی کرد بیبورە و ئەوەی کاریکی چاکیشی کرد بەچاك باسی بکە.

٣-جلوبەرگت خاوین بێ و بۆنت خۆش بێ، تا دەوروبەرەکەت پیت دلخۆش بن.

٤-گرنگی بەهاوکارانت بدە لەمیانـەی ئـەوەی، کـە لـە خۆشـی و ناخۆشـیەکانیان بەشداربیت و راوبۆچون و ئامۆژگارییان بدەیتێ و لە بۆنەکاندا دیارییان بۆ بکری، ئەگەر توانیت یارمەتی ماددی بدەیە ئەو کەسانەی ئاتاجن و هەمیشـە لـە ئـەحوالی خـۆی و خاوخێزانی بپرسی بەتایبەتی ئەگەر تۆ بەرپرسی کارەکە بوی، ئەگـەر گرفتێکیـان هاتـە پیش بەبێ دودلی هاریکاریان بکە.

٥-لە یارییە وەرزشیەکان و گەشتە تەرفیهیەکاندا، کە لە دەرەوەی شـوینی کـارن و دوورن لە کەشوهەوای کارەکە بەشدار بە، بەلاّم لەراددەش نەچیتە دەرەوە.

٦-لەوە وریابە کە لەلای هاوکارانت لیل و نارون بیت، لە لایاندا لە بـارەی خـۆت و ژیان و بیربۆچون و رەوشت بدوێ، بەلاّم لە سنور دەرنەچێ، کە بە خۆپەرسـتت تیبگـەن، هیندەش بەقولدا مەچو نهینیەکانت ئاوەلاّ بێ و بکەویە بەر رەحمـی نامـەردەکانیان لـە جیاتی ئەوەی متمانەیان وەدەست بینی!.

٧-خۆت لەو شتانە وەدوربگرە کە دەبنە ملیەی هەست بریندارکردنی هاوکارانت وەکو: ناو و ناتۆرەنان لە عەشیرەت و بنەماڵە و ناوچەکان، یان ئەو شتانەی بەوانەوە پەیوەندن، یان هەر شتێکی تر کە نارێکی و ناشیرینی ئەوان نیشان بدات، یان وەکو دەرخستنی عەیبە جەستەییەکان و شتی تر.

چونکە ئەم شتانە زۆربەی کات دەبێتە مایەی وروژاندنی رق و کینە و تورەیی نێو دڵ، ئەگەر چی لە ناخیشەوە نادیارە، بەلام دەبنە هۆی جۆرەها هەڵوێست نواندن بەرامبەرت، جا ئەگەر کارەکە وای خواست پێویستی بە ئامۆژگاری و چاکسازی هەبێت، ئەوا شێواز و رێگەی خۆی هەیە.

٨-با سۆزەکەت بەرهەڵدا نەبێ لە ئاراستەکردنی رەفتارکردنی سلبیانە و ئیجابیانەتەوە لەگەڵ هاوکارانت، بەڵکو لەهەمو ئەمانەدا مامناوەندی بە و کارزان بە و شت لە شوێنی خۆی دانێ، تۆ چوزانی! رەنگە دوای ئەمە خوا شتی تر بێنێتە دی.

* * *

## ڕەفتارکردن لەگەڵ کەسانی نالەبار لە کاردا

مرۆڤ هەر چەندی هەوڵ دات ڕەوشتی جوان بێت و ڕێگە زانستی و دەرونیەکان بەکاربێنێ بۆ ئەوەی باوەڕیەکەیان وەدەست بێنێ و پەیوەندیەکی چاکیان لەگەڵدا بینا بکات؛ توشی کەسانێك هەر دەبێ، کە ببێتە هۆی هەراسانی خۆی و دەوروبەرەکەی. جا ئایا ڕەفتارکردن لەگەڵ ئەم جۆرە خەلکەی کە وەکو برادەر لە کارێکدا پێیانەوە گرفتار دەبێ چۆنە؟.

**أ-مرۆڤ خۆی ئامادە بکات بەرگەی گرفتەکان بگرێت و ئارام بگرێ لەسەر شتە بێزارکەرەکان و ڕوبەروی شوێنەوارەکانیان بێتەوە**، ئەمەش بەم جۆرە:

١-بنیاتنانی باوەڕ بەخۆبون وەکو پێشتر باسمان کردوە.

٢-بایەخدان بە جەستە لەڕوی خواردن و نوستن و وەرزش کردنەوە.

٣-هەستی بە ئیجابیەت و خۆڕاگری و گەشبینی لەخۆت بێنیە دی، هەروەکو پێشتر باسمان کردوە.

٤-ڕاهاتن لەسەر ئاخاوتن و وتوێژکردنێکی سەنگینانە لەگەڵ خەلکیدا.

٥-هەڵنەهاتن لەگرفتەکان، بەلکو ڕوبەڕوبونەوەیان بەشێوەیەکی زانستیانە و شێوازێکی عەقلیی هێمنانە.

٦-خۆ دورگرتن لە توڕەبونی ئازاربەخش و هەلچونی زیانبەخش لە ڕوبەڕوبونەوەی گرفتەکاندا.

**ب-توێژینەوەی گرفتەکە و پلان بۆ دانانی**، بەم شێوەیەی خوارەوە:

١-بەر لەوەی بیر لە گرفتەکە بکەیتەوە، دەسنوێژێ هەڵگرە و زۆر یادی خوا بکە و دو ڕکاعەت نوێژی سوننەت بکە و داوا لەخوا بکە یارمەتیت بدات و گرفتەکەش چارەسەر بکات.

٢-لە شوێنێکی دور لە هەراوهۆریا دا پاڵ کەوە، تا جەستەت دەحەسێتەوە و ئەعسابت سارد دەبێتەوە.

٣-لە بیرکردنەوەکەدا لە برادەرە بەگرفتەکەتەوە دەست پێ بکە، لە سەرەتادا هەوڵ دە ئەو هەڵسوکەوتانە دیاری بکەی، کە گرفتەکانت بۆ دروست دەکەن، ئایا پاڵنەرەکانی ئەم هەڵسوکەوتانە چین، بۆ نمونە ئایا بریتیە لە دەستەواژە بریندارکەرەکانی، یان خۆ

بەرزگرتنە لە کەسانی تر، یان گومانکردنە لـە هەڵسـوکەوتی ئـەوانی تـر، یـان ڕەخنـە گرتنی بەردەوامە لە کارەکانیان، یان ئیرەیی[1] پێ بردنیانە بـەو پایـە و دەسـتکەوتانەی ئەوان هەیانە، یان هەڵسوکەوت و پاڵنەری ترە؟ گرنگ ئەوەیە گرفتەکە بـەوردی دیـاری بکرێ.

٤-ناسینی ئاسەوارە ڕاستەقینەکان لەسەر خۆت و کارەکەتدا، کە هاوکارەکـەت لـە ئەنجامی گرفتەکانەوە پەیدایان دەکات، بۆ نمونە ئایا لە کەشـوهەوای کارەکـەتدا توشـی بێزاری بوی، تا لە ترسی ڕووبەڕوبونەوەت بۆ سەرێشەکان بیر لەوە بکەیەوە ڕو لە کارێکی تـر بکـەی؟ ئایـا وات لێـهاتوە زوو زوو نەچیتـە سـەر کارەکـەت؟ ئایـا ئامانجـەکانی کارکردنەکەت لەبیرچوە؟ ئایـا بەرهـەمت کـەمتر بۆتـەوە و جۆرێتـی کارەکـەت بـەرەو خراپتری چوە؟.. گەلێ شـوێنەواری تـری هاوشـێوە، کـە نـاکرێ هـەمویان لـێرەدا کـۆ بکرێنەوە.

٥-بەپێی کاروشوێنی ئەوانەی باسمان کرد باشترین ڕێگا و سەرکەوتوترین هـەڵبژاردە دەسنیشان بکە، تاکو لـە گرفتەکـە ڕزگـار دەبیـت و شـوێنەوارەکانی لەسـەر خـۆت و کارەکەت نامێنێ. بەهێمنی و بەشێوەیەکی بابەتیانەوە هەڵبژاردنێك دەسنیشـان بکـە و ڕەچاوی بەرژەوەندی و نابەرژەوەندی و دەستکەوت و لەدەستچوەکان بکە، کە لە ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنەوە دێنە ئاراوە.

ڕەنگە چارەسەریەکە بەهۆی ئەمەوە بێ، کە ئاوڕ لە گرفتەکە، یان لـە دروسـتکەری گرفتەکە بدرێتەوە، یان لە بارەگای کارەکەت بیگوازیەوە بۆ شوێنێکی تر، یان تۆ خـۆت بگوازیەوە و کارێکی تر بدۆزیەوە، یان ڕوبـەڕوی مرۆڤەکـە ببیـەوە و وتوێـژی لەگـەڵدا بکەی.

٦-گریمان ئەو ڕێگە چارەیەی تۆ بڕیارت دا هەڵبژێری بریتی بـێ لـە مانـەوەت لـە کارەکـەدا و ڕوبەڕوبوەنـەوەی کەسـەکە و وتوێژکـردن بـێ لەگـەڵیدا، بـەو مەبەسـتەی شێوازەکەی بگۆڕیت. لەم کاتەدا هزرت ڕێکخەرەوە و بەڵگە و نمونـەکان ئامـادە بکـە و ئەو وشە و جوڵە و تەماشا و تۆنانـەی لەگـەڵیدا بـەکاردێنی دیـاری بکـە، هـەمو ئـەم فاکتەرانە بەیەکەوە لە پێناو مەبەستەکەت کار بکەن و ببنە مایەی ئـەو گۆڕانکاریـەی

---

[1] ئیرەیی: حەسودی .

دەتەوێ لەکەسەکەدا بێتەدی.

٧-پێشبینی کاردانەوەیەك بکە، دوای ئەوەی دواندنەکەت تەواو کرد، پێشبینیەکەشت بەگوێرەی شارەزابونی پێشینەت بێ بە لایەنی دەرونی و ستایلی شێوازی ئەو لە ڕەفتارکردن لەگەڵ کەسانی تردا.

٨-پلانەکەت بەگوێرەی کاردانەوەی پێشبینیکراو ڕێك خەرەوە، با ئامانجەکەت بریتی بێ لە کۆتایی پێ هێنان، یان کەمکردنەوەی ئەو گرفتانە بێ، کە بۆت پەیدا دەکات. ئاگاداربە هەوڵدانەکەت نەبێتە مایەی شەڕە قسە و توندتر بونی ڕکەبەرایەتی و زیاتر بونی گرفتەکە، تەنها بۆ ئەوە هەوڵ دە، کە گرفتەکە یەکلابکەیتەوە و شوێنەوارەکانی کەم بکەیتەوە.

٩-دوای ئەوەی پلانەکەت دوایین شێوەی کۆتایی خۆی وەردەگرێ، لەسەر پەڕە کاغەزێك بینوسەوە و پتر لە جارێك بیخوێنەوە. هەر بەوەندە مەوەستە کە بینە و بەردە و ڕێگەچارەی گرفتەکە تەنها لە مێشکت بهێڵیەوە، تەنها لەو کاتە نەبێ، کە ئەگەر بویە خاوەن ئەزمونێکی دور و درێژی سەرکەوتوانە بەهەمان ئەو ڕێگایەی کە پێشو باسمان کرد.

١٠-لەبارەی ئەو شتەی کە دەتەوێ بیکەیت، دەتوانی ڕاوێژ بە چەند هاوکارێکی ژیر و دیندار بکەی و تێبینی و ئامۆژگاریەکانیان لە پارچە کاغەزێکی تایبەت تۆمار بکەیت و پاشان بیر لەوە بکەیەوە کە تا چەند دەتوانی سودیان لێ وەرگری.

**ج-هەنگاوە کرداریەکان بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکە لەگەڵ گرفتار[1] و دروستکەری گرفتەکەدا:**

دوای ئەوەی بەشێوەیەکی گشتی خۆت بۆ ڕوبەڕوبونەوەی گرفتەکان ئامادە کرد و پلانێکی گونجاوی تایبەتیشت بۆ ئەم گرفتە دارشت، تەنها ئەوە دەمێنێتەوە کە ئامادەکاریەکانت جێبەجێ بکەی، کە هەنگاوە گرنگەکانی بریتین لەمانەی خوارەوە:

١-کات و شوێنێکی گونجاو و لەبار بۆ وتووێژکردنەکە هەڵبژێرە. کاتێکی وابێ کە تۆ دەسبەتاڵ و هێمن بیت و ئەویش لەبارێکی وادابێت، کە پتر لەحاڵەتی بابەتیانەوە نزیك بێ و لە داخوازی و پێداویستیەکانی کەسانی تر بگات و لە پێناویاندا لە هەندێ

---

١ گرفتار: ئەو کەسەی گرفتەکەی توش بوە.

هەڵوێستی خۆی دابەزێ.

٢-بەرێز و حورمەتەوە وتووێژی لەگەڵدا بکە و دەستەواژەکانت بەهەرەمەکی نەبێت و هەڵتبژاردبن. دوای ئەوەی ڕاوبۆچونی ئەوت لەبارەی گرفتەکەوە زانی، داوای یارمەتی لێ بکە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکە.

٣-ڕێگە چارە و پێشنیارەکان بخە ڕو، کە پێشتر ئامادەت کردبون. با خستنە ڕوەکەت بەشێوازێکی گونجاو و لەبار بێت و بۆی ڕون بکەوە، کە ئەم ڕێگە چارانە چەند سود بەهەموان دەگەیەنێ.

٤-دەگەڵ هزر و پێشنیارە سودبەخش و ئیجابیەکان، کە ئەو دەیخاتە ڕوو بەدەنگ وەرە و لەو حاڵەتانەی کە پێویستی بە یارمەتی هەیە و تێیدا لاوازە سۆزی لەگەڵ بنوێنە. لەجێی ئەو شتانەی، کە ئەو وا تێدەگات سودیان لێ دەبینێ، ئەگەر گرفتێکت بۆ پەیدا بکەن جێداری تری بۆ بخە ڕوو.

٥-لە کۆتایی دیدەنەکەدا ئەو خاڵە هاوبەشانەی لێیان گەیشتونە ئەنجامێك دیاریان بکە و، ئەرکی هەردولا لەمەڕ خاڵەکان ڕون بکەوە.

٦-ئەگەر چەند مەسەلەیەکی شایەن بە توێژینەوە و وتووێژ لەسەر کردن مانەوە، ئەوا کاتێکی تر بۆ بەیەکتر گەیشتنەوە دیاری بکە.

٧-موتابەعەی جێبەجێکردن و وەدیهێنانی ڕێککەوتنەکە بکە و مەودای پێشکەوتنی هەڵسەنگێنە.

٨-پێویستە لەکاتی وتووێژەکەدا ئەعسابت هێمن بێ و هەسانەوەیەکی جەستەیی و دەرونیت هەبێ. باشتریشە ئەگەر ماوەیەکی خۆخاو کردنەوەی پێشینەیی لەگەڵدابێ.

٩-خەڵاتی کەسەکە بکە لەسەر ئەوەی، کە ئەگەر تێبینیت کرد هاریکارە و چەند هەنگاوێکی بۆ چارەسەری گرفتەکە هاوێشتوە و پابەستە بە ڕێککەوتنەکە. سۆز و ڕێزی بۆ بنوێنە و لەڕویدا بزە بخە سەر لێوانت، لەبەرچاوی هاوکارەکانی تردا سوپاسی بکە و پێیدا هەڵبڵێ لەپای ئەوەی، کە ڕێگایەکی تازەی گرتۆتە بەر، ئەگەر گونجاوبێ دیاریشی پێشکەش بکەو یارمەتیشی بدە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی نێو کارەکەی.

* * *

# بەرزکردنەوەی ڕادەی بەرهەمهێنان

زیادکردن و چاکترکردنی بەرهەم بریتیە لە ئامانجی هەر کارێکی کە مرۆڤ بیکات، ئەگەر کارکردن بەرهەمی تازەی لێ نەکەوێتەوە، ئەوا کرد و کۆشیکی لەدەست چوو و وزەیەکی بەهەدەر دراوە، بۆیە یەکێك لە گرنگترین ئەو شتانەی، کە تاك و دەزگاکان هەمیشە بۆی هەوڵ دەدەن بریتیە لە زیادکردنی بەرهەمەکەیان. جا لەبەر ئەوەی ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە کارەوە هەیە، بۆیە وام بەباش زانی کە هەندێ لەو ڕێشنایییە[1] گشتیانە باس بکەم، کە یارمەتی بەرزکردنەوەی ڕادەی بەرهەم هێنان و بەرزکردنەوەی ئاستی هەر کارێك دەدەن.

## ڕەگەز و بنچینە کارتێکەرەکان لەبەرهەمهێناندا:

١-دارایی.

٢-هزرە داهێنەرەکان.

٣-کارگێڕیی سەرکەوتو.

٤-دەستی مەشق پێکراوی کارکەر.

٥-داهاتە سەرەتاییەکان.

٦-دەزگا و ئامێرەکان.

٧-بازاڕێکی چاك بۆ بەرهەمهێنان.

## چۆن دەتوانرێ ڕادەی بەرهەمهێنان بەرزبکرێتەوە؟

١-دەبێ بەر لەوەی لە کارەکەدا دەسبەکار بی، خاڵە هاوبەشەکانی نێوان خۆت و کارەکەت بدۆزیەوە، ئەمەش وات لەسەر پێویست دەکات کارەکە بتۆژیەوە و بگەیە حاڵەتی ڕازیبون بە کەڵك و گرنگی کارەکە و ئامانجەکانی کارەکە ببێتە ئامانجی کەسی و نەتوانی لە وەدیهێنانی دابەزی.

---

[1] ڕێشنایی: ارشاد .

٢-تێگەیشتن لە کارەکە و ناسینی سروشتی پێداویستیەکانی؛ مەرجێکن بۆ پەرەپێدانی.

٣-دابینکردنی پێداویستیە بنچینەییەکانی کارەکە، وەکو ئامادەسازی و مەشق پێکردنی کرێکاران، توانا ماددیەکانی وەکو ئامێر و دەزگا و کەل و پەل و کەرستە خاوەکان، هەروەها کەمکردنەوەی بەربەستەکان.

٤-خاڵیی کردنی زەین لە هەمو سەرقاڵیەکانی تر و تەرخانکردنی تەواوی هێزر بۆ کارەکە لەکاتی کارکردندا.

٥-یەك لە رێگایە هەر گرنگەکانی بەرزکردنەوەی رادەی بەرهەمهێنان ئەوەیە، کە سەرۆك و بەرپرسەکانی کار، دەستخۆشانە[١] بەو کەسانە ببەخشن و هانیان بدەن و خەڵاتیان بکەن کە خاوەنی بەرهەمهێنانی بەرز و ئەنجامدانی خێرا و پوختەن. جا رەنگە دەستخۆشانە کە بریتی بێ لە پارە، یان خزمەتکردنێك، یان بەرزکردنەوەی پلەی فەرمانبەریتی، یان سوپاسنامە و رێزنامە بێ، پێویستە رەچاوی میکانیزمێکی ورد و بابەتیانە بکرێ لە هەڵسەنگاندنی رادەی بەرهەمهێنانی کرێکارەکان و دوربێ لە خاترانە و خۆشەویستانە.

٦-لەلای کرێکارەکان ئەم هەستە دروست بکرێ، کە ئەوان ئاسایشی فەرمانبەریتیان هەیە و دوارۆژ و مافی خۆیان و خاو خێزانیشیان لەپاشی خۆیان پارێزراوە. چونکە هەر کاتێ ئەگەر کرێکار وا هەست بکات، کە خراوەتە بەر کۆمەڵە بڕیارێکی ستەمنامێز و نا دادگەرانە و نایەکسانەوە، ئەوا ناتوانێ لێبڕانێکی زەینی بگرە جەستەییش بۆ کار و بەرهەمهێنان بێنێتە دی.

٧-وابەستەی ئەوە بە کە هیچ کاتێکت لە کارەکە بترازێ لێ نەڕوات، چونکە یەکەمجار ئەو کاتە ڕاسپاردەیەکە و خوا لێت دەپرسێتەوە، دوەمجاریش کاریگەرێکی زۆر سلبی، یان ئیجابی دەخەنە سەر بەرهەمهێنان.

---

١ دەستخۆشانە: مکافأة .

٨-سود له ئەزمون و شارەزاییەکانی ئەوکەسانە وەرگرە، کـە بـەر لـەتۆ کارەکـەیان کردوە، جا بەهۆی تەلەفۆن بێ، یان بەهۆی نامە ناردنەوە بێ، هەروەها لەبارەی هـەندێ بابەتی دیاریکراوەوە ڕاوێژیان پێ بکە.

٩-وەشوێن هەمو شتێکی تازەی بـواری کارەکـەت بگـەڕێ و سـور بـە سـودیان لێ وەرگـری، باشـترین ڕێگـاش خوێندنەوەیـەکی بـەردەوامی گۆڤـار و بڵاوکـراوە خولییـە تایبەتیەکانی ئەو بوارە و، نامـە گۆڕینـەوە و هامۆشـۆکردنی مەڵبـەندەکانی مەشـق و تۆژینەوە و پێشانگاکانە، ئەگەر دەرفەتت هەبێ.

١٠-بایەخ بە پەرەپێدانی تایبەتمەندێتی داهێنان و تازەگەری و ڕانان(إبتكار)ی خۆت بدە بەگشتی و بەتایبەتیش لە بواری کارەکـەتدا، ئـەویش بـەهۆی خوێندنـەوە و خولـە مەشقیەکان و ئامادەبونت لە کۆڕ و سیمینار و وانە گرنکەکانی تایبەت بەم لایەنەوە.

١١-هەقی خۆی لە مۆڵەت و هەسانەوە بدە بە دەرونت.

١٢-پەیوەندی برایانەی چاکی خـۆت لەگـەڵ سـەرۆك و هاوکـار و بەرفەرمانـەکانت بەردەوام بەباشترین شێوە ڕاگرە.

## دیاردە و بەڵگەکانی لاوازی ڕاددەی بەرهەمهێنان لە کاردا:

١-نەبونی پلانێکی ڕون و سەرکەوتو بۆ کارەکە و پەلکوتانی کرێکاران بەشـێوەیەکی هەرەمەکیانە.

٢-جێبەجێ نەکردنی پلانی داڕێژراو و پەیڕەوکردنی بیرەنجامە[1] کەسیەکان لـەجیاتی ئەودا.

٣-خەریکبون بە کاروباری ترەوە لەکاتی کارکردندا.

٤-ئامادەبونی درەنگتر و دەست لەکار هەڵگرتنی زووتر لـە کـاتی دەوامـی ڕەسمـی دەزگاکەدا.

٥-زۆر وەرگرتنی مۆڵەت و عوزر خواستن، جا بەهەر ڕێگایەکەوە بێ.

---

١ بیرەنجام: هزرەنجام، إجتهاد.

٦-ڕقبونەوە لە چاوپێکەوتن و وتووێژکردن و گفتوگۆکـردن لەگـەڵ بەرپرسـەکەدا لـە بارەی کارەکەوە.

٧-زۆر لـە یـاد کردنـی ئـەو ئەرکانـەی بـە فەرمانبەرەکـە، یـان بـە کرێکارەکـە دەسپێردرێ، یان خۆی وا دەنوێنێ کە لەبیری کردون.

## هۆیەکانی کەمیی ڕاددەی بەرهەمهێنان لە کاردا:

١-قەناعەت نەبونی کرێکار بەکار.

٢-تێنەگەیشتن و نەفامیدەیی و تێکەڵنەبون لەگەڵ کاردا.

٣-نەبونی توانا لەسەر ئەنجامدان و ڕاپەڕاندنی کارەکە بەپێی خوازراو، جا یـا لەبـەر هۆیە خودییەکانی کارەکە بێ، یانیش بەهۆی کـەم و کورتـی توانسـتە تـەرخانکراوەکان بێت، یاخود لەبەر بونی بەربەست بێ لەنێونەبراو و دورنەخراوەکان بێت.

٤-وەپێشخستنی کارێکی تر، یان تـەنگ پێهـەڵچنینی بـەهۆی کـارێکی تـرەوە و کەمتر گرنگی پێدانی.

٥-نەبونی جددیەت لە ژیانی کرێکاردا.

٦-هەستکردنی کرێکار بەرێزنەنان لەو کەسانەی، کە لە دەزگاکەدا وەبەرهەم دێنن و کارەکان ڕادەپەڕێنن.

٧-بونی گرفت و چەرمەسەری لەگەڵ هاوکاران و بەرپرسـان و بەرفەرمانان و کەسـانی

* * *

# بەڕێوەبردن لە چەند دێڕێکدا

هیچ کارێك نیە پێویستی بە بەڕێوەبردن نەبێ، چونکــە بــەڕێوەبردن شــتێکە هــەمو کەس پێویستیەتی، ڕەنگە هەندێ کەس پسپۆڕێتیشی تێدا وەرگرن. خێزان و فەرمانبــەر و بازرگان و جوتیار و گاوان هەمویان پێویستیان بە بەڕێوەبردن هەیە، تا کارەکەیان پــێ بەڕێوە ببەن. ئەمانەی لە خوارەوە باسیان دەکەین هەندێکن لەو هــزرە گشــتیانەی، کــە لــەبارەی بەڕێوەبردنــەوە دەدوێــن بەتایبــەتی بــەڕێوەبردنی کارێکــاران لــــەکارە فەرمانبەرێتیەکاندا.

## بەڕێوەبردن چیە؟

بریتیە لە پــلان دارشــتن و پاشــان جێبــەجێکردن لــە بــەکاربردنی توانســتە لــەباردا هەبوەکان و، هەماهەنگی کردن لە نێوانیاندا بۆ وەدیهێنانی ئامانجە خوازراوەکان لــەژێر سێبەری ئاراستەکردن و چاودێری کردندا.

## جۆرەکانی بەڕێوەبردن:

لە ئــەنجامی پێشــکەوتنی زانســتی بــەڕێوەبردن و زۆری توێژینــەوەکان لــەم بــوارەدا تۆژەرەوانی زانستی بەڕێوەبردن توانیویانە جۆرەکانی بەڕێوەبردن لەیەکتر جوێ بکەنــەوە، جوێکردنەوەکە هەڵقوڵاوی نێو واقیعی ژیانی خەڵکە. ئەمانەش گرنگترین جۆرەکانیەتی:

**١-بەڕێوەبردن بە لیســتی هەڵواســراودا:** بریتیــە لــەو جــۆرە کارگێڕیــەی کــە بــە زێدەڕۆییەوە سیســتەم و لیســتە هەڵواســراوەکان جێبــەجێ دەکــات، بێنــەوەی ڕەچــاوی ئاسەوارەکانی ئەم زێدەڕۆییە بکرێت کــە چ زیــانێك بــە کرێکــاران دەگەیــەنێت و چــەند ئامــانج بەهــەدەر دەدات، کــە کارەکــەی لــەپێناودا دەکرێــت و دەزگاکــــەی لــــەپێناو دامەزرێنراوە. ئەم جۆرە بەڕێوەبردنە ڕوحی داهێنان و تازەگەری و نوێکاری ون دەکات و دژی سەرچڵی و پێشکەوتنە و کارگێڕیەکی لاساخوازانەیە.

**٢-بەڕێوەبردنی کاردانەوەیی:** بریتیە لــەو بەڕێوەبردنــەی کــە ســەیری کەســانی تــر دەکات داخوا چ دەکەن تا ئــەویش کاردانەوەیــەك بکــات، هەمیشــە بــە غــەیری خــۆی

کاریگەرە و لە حاڵەتی شـوێنکەوتەیی یـان بـەرگریکردن دایـە، هیـچ پـلان و لیسـتی هەڵواسراو و سیستەم و پێشخستن و نوێکاریەکی نیە.

**٣-بەڕێوەبردنی قەیرانەکان:** بەڕێوەبردنێکی تایبەتمەندە لە ڕوبەڕوبونەوەی ئەو حاڵە لە پڕ و نەکا و قەیرانانەی کە هەمیشەیی نین.

**٤-بەڕێوەبردنی کەمەندکێشی کەسێتی:** بریتیـە لـەو جـۆرە بەڕێوەبردنـەی، گـە بەرپرسەکە کەسێتیەکی کەمەندکێش و بەهێزی وای هەیە، کە بەڕێوەبردنەکە لـە دەوری خودی بەڕێوەبەر دەخولێتەوە، نەك بەدەوری کار و لیستی هەڵواسراو و ئامانجەکان.

**٥-بەڕێوەبردنی دابەزین لە هەمو حاڵەتێکدا:** بریتیە لەو جۆرە بەڕێوەبردنــەی کـە لەسەر بنچینەی دابەزین لە مافی ڕەوا و ڕازیبون بە واقیع و، ترسان لـە ڕوبەروبونـەوەی گرفتەکان و سور بون لەسەر ڕازیکردنی کەسانی تر دامەزراوە.

**٦-بەڕێوەبردنی هەواڵە دڵخۆشکەرەکان:** لەسەر ئـەوە دامـەزراوە کـە پروپاگـەندە بکات، یان دەستکەوت و هەواڵە خۆشەکانی دەزگاکە، یان هی کرێکارەکان گەورە بکات و خۆی لە گرفتەکان لابەلا دەکات، بەچاوێکی بابەتیانە ناڕوانێتە کاروبارەکان، تـا ئـەو ڕۆژەی ڕوبەڕوی ئاستەنگ و کارەساتەکانی دەبێتەوە.

**٧-بەڕێوەبردنی کاربەخشینەوەی ڕەها:** ئـەو بەڕێوەبردنەیـە کـە لەهـەمو شـتێکدا جڵەوی کارەکان دەخاتە دەسـت فەرمانبـەرەوە بـۆ ئـەوەی لێپێچانـەوە و لێپرسـینەوەی بەدوادا بێت.

**٨-بەڕێوەبردنی بەشدارکاری:** ئـەو بەڕێوەبردنەیـە کـە بەڕێوەبـەر و کرێکارەکـانی دەوری بەڕێوەبەر لە هەڵگرتنی بەرپرسـێتی و بڕیاردانـەکان و جێبـەجێکردنیان بەشـدار دەبن.

**٩-بەڕێوەبردنی ئامانجەکان:** ئەو بەڕێوەبردنەیە کە بەڕونی ئامانجەکان بۆ کرێکـاران وەدەردەخات، پاشان هەوڵدان بۆ وەدیـهێنانی ئامانجـەکان بەسـەر کرێکارەکـان دابـەش دەکات بەجۆرێك، کە گشـت تاکـەکان بـە بـەردەوامی هـەوڵدەن هەریەکـە و ئامـانجی دیاریکراو و ڕونی خۆی وەدی بێنێ.

## مەرجەکانی سەرکەوتنی پرۆسەی بەڕێوەبردن:

١-کۆکردنەوەی زانیاریەکان و ڕێکخستن و پۆلێنکردنیان لەسەر تـەواوی ئاسـتەکانی کاردا.

٢-ئاسانکاریکردنی پەیوەندیکردنەکانی نێوان کرێکاران لـە دەزگاکـەدا و بەربەسـت نەخستنە نێوانی بەرپرس و کرێکارەکان.

٣-دۆزینەوەی دنەدەر و هاندەرەکان و ڕێزانەکردنی[1] کرێکارە دیـار و چالاکـەکان و، سەرنج ڕاکێشانی کەمتەرخەمەکان.

٤-باوەڕی بەیەکتر کردن لە نێوان کرێکـاران و بەرپرسـان و ئـەوانی تریـش و بونـی پەیوەندیەکی چاك و خۆشەویستانە و پێکەوە هۆگر بون، لە هـەمان کـاتدا ڕێککـاری و گوێڕایەڵبونێکی بەرچاو ڕونانە هەبێ لە کارەکەدا، کە ئەمانە دەبنە مایەی کارکردن بـە روحیەتی کۆمەڵکاری و هەرەوەزکاری.

٥-ناسـینی توانـا و وزەی کرێکـاران و ئاڕاسـتەکردنیان بەشـێوەیەکی ڕاسـت و ڕێکوپێك.

٦-دیاریکردنی پسپۆریەکان و دەسەڵاتەکان و تێکەڵ نەکردن و تێکنەشێلانیان.

٧-خۆشەتەکدان[2] لە ڕوبەروبونەوەی گرفتەکان و دانی بڕیارەکان.

٨-بەر لەهەمو ئەمانەش رونی ئامانجەکان لە کارەکەدا لـەلای گشـت کرێکارەکـانی دەزگاکە، هەریەکە و بەگوێرەی پلەوپایەی خۆی.

## جۆرەکانی بەڕێوەبەر:

**١-بەڕێوەبـەری بایـەخدەر بـەکار و فەرامۆشـکەری کرێکـاران.** ئـەو جـۆرە بەڕێوەبەرانەن، کە سورن لەسەر بەجێگەیاندنی دەوامێکی تەواو و پراکتیزەکردنی[3] پێـت بە پیتی لیستە هەڵواسراوەکان و سیستەمی دانراو لەپێناو پاراسـتنی کارەکـەدا. بـەڵام ماف و ئاتاجی کرێکارانی هەر بەخەیاڵیش دانایێت، خۆی خۆشەویست ناکات و ڕەچاوی

---

١ دنەدەر: حافز   ڕێزانە: إکرامیة .
٢ خۆشەتەکدان: حزم .
٣ پراکتیزە: تطبیق .

بارودۆخیـان ناکـات. بـەمجۆرە لەسـەرەتادا سـەرکەوتو دەبـێ، بـەڵام سـەرەنجامەکەی تەقینەوەی گرفتەکان و وروژاندنی رق و کینەیە و کارەکەش سەرکەوتو نابێ.

**٢-بەڕێوەبەری بایەخدار بە کرێکاران لەسەر حیسابی کاردا.** ئەمەیان پێچەوانـەی جۆری یەکەمە و لە کۆتاییدا فەشەلێکی خراپتر لە فەشەلی جۆری پێشو دێنێ.

**٣-بەڕێوەبەری سلبیکار** کە لە خۆی بترازێ بایەخ بەهیچی تـر نـادات، تەنـها بـەو ئەندازەیە بیر لەکار و کرێکاران دەکاتەوە، کە خزمەت بە بەرژەوەندیەکانی خۆی دەکـات و حەزەکانی دێننە دی. ئەم جۆرەیان وێرانی خەڵك و وڵات دەنێتەوە.

**٤-بەڕێوەبەری هاوسەنگ** کە هەم مـافی کـار و هـەم مـافی کرێکـاریش دەدات و لەنێو هەراوهەنگامەی کاریشدا مافی خۆیشی لەبیر ناکات. ئەم جۆرەیان بەڕێوەبـەرێکی سەرکەوتوە.

## سیفەتەکانی بەڕێوەبەری سەرکەوتو:

**١-دەسپاکی:** دەسپاکی مەرجی سەرکەوتنی گشت کارێکـە و بـۆ بەرپرسـانیش پـتر زەرورین، چونکە بەرپرس بە ئەمین دانراوە لەسەر مـافی دەزگـا و فەرمانبـەرەکان، جـا ئەگـەر دەسـپاك نـەبێت ئـەوا مافـەکان بـەفیڕۆ دەدرێـن و کارەکـە فەشـەل دێنـێ و بەڕێوەبردنەکە تێکوپێك دەچێ. خۆ ئەگەر دڵسۆزیی مـەرجێکی سـەرکەوتنی کـار بـێ، ئەوا بێگومان ئەو کاتە دڵسۆزیی دێتە دی کە دەسپاکی هەبێ.

**٢-زانست و شارەزایی:** کار بەڕێوەبردن بەزانستێکی پسپۆڕیانەی بواری کارەکە و بە شارەزایی کردارییانەی پسپۆڕیەکەوە دەبێتە کار. چونکە بەبێ زانست بەڕێوەبـەر دەبێتـە کەسێکی لاساکەرەوە و پەیڕەو هەر لەو شتانە دەکات، کە بەدرێژایی ساڵان لە مـەیدانی کاردا فێری بوە. نەبونی شارەزاییش وادەکات، کە زانستەکەی بەڕێوەبەر هـەر بـەتیۆری بمێنێتەوە و لەکاتی پێویستی نێو حاڵەتە پراکتیکیەکاندا دادی نادات.

**٣-هێز و توانا بۆ جێبەجێکردن:** ئەو کەسەی کە هێزی نەبێ ناتوانـێ کرێکارەکـان لەگـەڵ خـۆی ڕێـك بخـات، بـەڵکو ئـەوان بـەگوێرەی ئـارەزو و بەرژەوەندیـەکانیان هەڵیدەسوڕێنن. ئەو کەسەی کە دەستڕۆیشتویی و توانـای نـەبێ لەسـەر جێبـەجێکردنی بڕیارەکان وەکو دیکۆرێك وایە، کە لە نوسینگەدا دامەزرێنرابێ و هیچی تر.

**٤-خۆ بەگەورە نەزانین لە رەفتارکردن لەگەڵ فەرمانبەر و ئەو جەماوەرەی** پەیوەندییان بە دەزگاکەوە هەیە. وەك چۆن پێویستە بەڕێوەبەر بەهێزبێ بێئەوەی توندوتیژ بێ، هەروەها پێویستە خۆ بە گەورە نەزانێ، بێئەوەی لاواز و زەبون بێ، تاکو دڵەکان بۆ خۆی ڕاکێشێت و هەمو هەوڵدەن هاریکاری لەگەڵدا بکەن.

**٥-نەرم و نیانی و ئارامی:** دو مەرجن بۆ هەمو ئەو کەسانەی، کە لە ژیاندا دەبن بە پێشەنگ و بەبێ ئەم دوانە سەرۆکایەتی و ڕێبەرایەتی بونیان نیە.

**٦-ڕاستگۆیی:** چونکە هیچ کەس باوەڕ بە درۆزن ناکات، جگە لەمە لە ڕێزگرتن و یارمەتی خەڵکی بێبەش دەبێ.

**٧-ڕاوێژکردن:** چونکە مرۆی ستەمکار دەتوانێ جەستەی خەڵك بەرەو کارێك ببات بەڵام دڵ و دڵسۆزی و وزەکانیان نا. ڕەنگە بتوانێ بەردەوام بەرەو کار راپێچیان بکات، بەڵام لەم حاڵەتەدا کارەکە هەڵە و نادروستیەکی زۆری تێدەکەوێت.

**٨-دان پیانان بەهەڵەی خۆ ئەگەر هەڵە بو:** هەروەها تەوازۆش[1] بخوازێ و پەشیمانی دەربڕێ و نەگەڕێتەوە سەری.

**٩-بلیمەتی و بیرتیژیی:** نابێ بەئاسانی بخەڵەتێنرێ ئەگەر چی ڕاستگۆییەکەی خۆی ڕێگرە لەبەردەم هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی.

❊ ❊ ❊

---

[1] تەوازۆ: عوزر.

## هونەری وتووێژکردن

وتووێژ و گفتوگۆ یەکێکن لە پێویستیەکانی ژیانی مرۆڤایەتی، مرۆڤ لــە ماڵــەوە و لەگەڵ خاوخێزانی، هەروەها لەگەڵ برادەرانی، یا لەگەڵ گروپەکانی تر، کە نوێنەرایـــەتی بەرژەوەندی و ڕاوبۆچونی لایەنی تری جیا لــە لایــەنی کارەکــەی دەکــەن، پێویســتی بــە وتووێژ هەیە و ناتوانی دەسبەرداری بێ. فێربونی چۆنیەتی وتووێژکــردن بــۆ وەدیــهێنانی باشترین ئــەنجام بوەتــە زانســتێك و لــە زانکۆکــان دەخوێندرێــت. ڕۆژئاواییــەکانی ئــەم سەردەمە لەم بابەتەدا داهێنانیان هێناوەتە ئاراوە و بەهۆیەوە گــەلێ ســەرکەوتنیان لــە دەسەڵات ڕاهێلان بەسەر جیهاندا وەدیهێناوە، بەتایبــەتی لــەو وتووێژانــەی، کــە پێیــان دەڵێن وتووێژی ڕامیاری، یان ئابوری.

موسڵمانانی پێشــان لــە هونــەرەکانی وتوویــژ و گفتوگــۆ و مشــتومڕ و مــێزگرددا، داهێنانی گەورە گەورەیان تۆمار کردوە و لەم بارەوە چــەندین کتێبیــان دانــاوە و هــەمو جۆرەکانیان لە یەکتر جوێ کردۆتەوە و بۆ تانوپۆی[1] ئەم هونەرانـــەش گەڕاونەتــەوە ســەر قورئان و فەرموودە و لەوانەوە بنەماکانیان دەستنیشان کردوە.

بەڵام نەوەکانی پاشتر لە سەدەکانی دواییدا لەم هونەرانە، کەمتەرخەم بون وەك چــۆن لە مەسەلەکانی تریش کەمتەرخەم بون، کە بەهۆیانەوە دواکەوتویی بڵاوەی سەند.

لێرەدا ناکرێ لەم پەلەنامەیەدا بە دوورودرێــژی بــاس لــە بابــەتی وتوویــژ و گفتوگــۆ بکەین، بەڵام دەکرێ باس لە هەندێ لایەنە گرنگــەکانیان بکــەین، کــە ئەگــەر خوێنــەر بیاخوێنێتەوە دەتوانێ توانستەکانی خۆی لەم بارەوە پەرە پێبدات.

### گرنگترین لایەنەکانی ئەمانەن:

**أ-خۆ ئامادەکردن بۆ وتووێژکردن:** ئەمەش بەوە دەکرێ کە گرفتەکە تاووتوێ بکرێ و پلانێك بۆ وتووێژەکە دابڕێژرێ. خۆئامادەکردنەکــە بــەهۆی ئــەم ڕەگەزانــەی خــوارەوە دێتەدی:

**١-بەڕونی ئەو گرفتە دیاری بکــرێ کــە بۆتــە هــۆی دوبــەرەکی لــەنێوان خــۆت و** لایەنەکەی تر کە وتویژت لەگەڵدا ساز دەکــات. چونکــە دانیشــتن لــەوتوویژدا بیئــەوەی

[1] تانوپۆ: بنچینە، أصل .

زانیاریەکی تەواوت لەبارەی حەقیقەتی گرفتەکەوە هەبێ ئەوا فەشەل و دۆڕان دەبێتە بەشت.

**٢-ناسینی لایەنەکانی دوبەرەکی**، چونکە ئەگەر ئەو لایەنەی کە وتوویژی لەگەلدا دەکەی نەناسیت، ئەوا لەکاتی وتویژکردنەکەدا توشی هیدمە[١] دەبیت، ڕەنگە یەك لایەن یان پتر لە لایەنیك روبەروت ببنەوە، کە هەریەکەیان نوینەرایەتی بەرژەوەندی و هزرە تایبەتیەکانی خۆیان دەکەن.

**٣-ناسینی رای هەر لایەنیك بەسەربەخۆیی**، بزانی کام خاڵ خالی هاوبەشی نێوانتانە و بۆچونەکان تێیدا یەك دەگرنەوە و کام خاڵیش مایەی دوبەرەکی بونە؟ کام ڕەگەز ڕێککەوتنن، کامیشیان مایەی جیابونەوەن؟ مەودای لێك تێگەیشتن چەندە ئەگەر چی لایەنی بەرامبەریش نەیەوێت تێ بگات؟

**٤-تۆژینەوەی کەسایەتیەکان** یان ئەو کەسەی کە نوێنەرایەتی لایەنێك لە لایەنەکان دەکات. چونکە راوبۆچون و هزر و بەرژەوەندیەکانی لایەنەکە هەر چۆنێك بێ، ئەوا کەسایەتی نوێنەری لایەنەکە بۆ وتووێژکردنەکە هەر کاریگەری هەیە لەسەر بەڕێوەچونی ووتووێژەکە، کاریگەریەکەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تریش دەگۆڕێ. تۆژینەوەکەش دەبێ گشت لایەنە جۆراوجۆرەکانی کەسێتی وتووێژەکە بگرێتەوە:

لایەنی مێژوویی، ڕەفتاری، هزری، رۆشنبیری، ڕەوشتی، دەرونی و هەر لایەنێکی تریش کە لەتوانادا هەبێ بتۆژرێتەوە. ئەو وتووێژکەرەی پتر زانست و زانیاری لەبارەی ئەوەی ترەوە هەبێ؛ زیاتر سەرکەوتن دێنێت و کۆنترۆڵی ئەوەی تر دەکات و دەیخاتە نێو چنگی خۆیەوە.

**ب-داڕشتنی پلانێکی گونجاو بۆ وتویژکردنەکە**. چونکە دوای خۆ ئامادەکردن بۆ وتووێژەکە بەپێی توێژینەوەکانی پێشتر؛ دەبێ پلانێکی پراکتیکی بۆ ڕەوتی وتووێژەکە دابڕێژرێت، کە ئەمانەی خوارەوە گرنگترین ڕەگەزەکانیەتی:

**١-دیاریکردنی ئامانجەکانت لە وتوێژەکەدا بەشێوەیەکی رون و ئاشکرایی**. هەروەها ریزکردنی ئامانجەکانت لەنێوان ئەو پەڕی ئاواتت کە بۆی هەوڵ دەدەی تا ئەم پەڕی کەمترین رادەی قبوڵکردن. لەم بارەوە هیوادارم بگەڕێیتەوە سەر جێباسی دروست

---

[١] هیدمە: لەنکاوی، مفاجأة.

کردنی ئامانجەکان، کە لە سەرەتای ئەم کتێبەدا باسم کردوە.

**٢-پێشبینیکردنی ئەو ئامانجانەی کە لایەنی بەرامبەر هەوڵی بۆ دەدا لە وتووێژەکەدا وەدییان بهێنێ**، هەروەها کەمترین رادەش کە ئەوان قبوڵیانە.

**٣-دۆزینەوەی جێدار (ئەلتەرناتیف)ی رازیکەر و قبوڵکراو لەلای بەرامبەردا**، تا ئەگەر تۆ ئامانجێکی ئەوانت قبوڵ نەکرد، ئەوا جێدارەکەی بۆ بخەیتە ڕو.

**٤-دانانی کۆمەڵە ڕێگایەکی گونجاوی وا کە کار لە بەرامبەر بکات** و ئەو ئامانجانەی تۆ بەئاواتت گرتون قبوڵیان بکات.

هەروەها هەوڵدەی قەناعەتیان پێ بێنی، کە ئامانجەکانی تۆ، یا خزمەت بە بەرژەوەندی ئەو دەکات، یان هەر هیچ نەبێ زیانی پێ ناگەیەنێ.

ئاگاداری ئەوەش بە کە لەکاتی وتووێژەکەدا لەلایەنە کەسییەکاندا دەماریان نەگری.

**٥-بردنەوەی ئەو کەسانەی لە وتووێژەکەدا بەشدارن**، تا ببێتە ڕێخۆشکەرێك بۆ بردنەوەی دۆزەکە و وەدیهێنانی سەرکەوتن لە وتووێژەکەدا. بۆ ئەم مەبەستە دەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ بەندەکانی پیشوی ئەم کتێبە.

**٦-تەرکیزکردن و بایەخدان بە ئامانج و مەبەستەکان** و چاوپۆشین لە شتە شێوەییەکان (شکلیەکان) و هەڵوێستە هەڵنانەکان و ڕاگەیاندنە ئیعلامیەکان، مەگەر لەو کاتەی ئەوانیش ئامانجێك بن.

**٧-پێشبینیکردنی ئەگەرە جیاوازەکان** لەکاتی وتووێژدا و ئامادەکردنی ڕێگە چارە گونجاوەکانیان و پاراستنیان تاکاتی پێویست.

**٨-دانانی ڕێگە چارەی مامناوەندی بەرتوان** (ممکن) و قبوڵکراو لەلای هەردو لایەندا لەو کاتەی، کە ناگەنە یەك و هاودەنگ نابن و ڕازیبونی لایەنێك بە ئاواتی لایەنەکەی تر بەو مەرجەی لە کەمترین رادەی قبوڵکراوی ئامانجەکان دانەبەزێ.

**٩-مەشق و خۆ راهێنانێکی چاك لەسەر جێبەجێکردنی پلانی دارێژراو** بەر لە دەسپێکردنی وتوێژەکەدا.

**ج-دەسپێکردن بە پرۆسەی وتوێژەکە**، کە گرنگترین قۆناغەکانی ئەمانەن:

**١-قۆناغی ناسین و وەرگرتنی شارەزایی** لەبارەی گروپی وتووێژەکەردا و لە نزیکەوە ئاشنایان بیت و توێژینەوەکانی پێشینە و پلانەکەی داتڕشتوە، تا لەبەر ڕۆشناییەکەوە

هەنگاو هەڵگری و بەسەری بکەیتەوە و ئەو شوێنی پێویستی بە گۆرانکاری هەبێ بیانگۆریت و ڕێکی بخەیتەوە.

**٢-قۆناغی ڕوبەڕوبونەوەی گرفتەکە** و تاوتوێکردن و گفتوگۆ کردن لەبارەیەوە، کە ئەمەیان گرنگترین قۆناغی وتوێژکردنە. لەم قۆناغەدا پێویستە هزرەکانت ریك بخەیت و باش گوێ بگریت و ئارامت هەبێ لەسەر ئەو وشك و رەقییانەی، کە لە بەرامبەرەکەوە دەنوێنرێن. هەروەها ئەگەر هەق بەلای ئەودا بوو بیسەلمێنیت و قبولی بکەیت و دان بەهەلەکانی خۆت دابینی و بەپێی توانا لە هەلەکانت پاشگەز بیتەوە، رەچاوی ئاست و رۆشنبیری بەرامبەرەکەت بکەیت و شێوازی جۆراوجۆر بەکاربێنیت بۆ ڕانواندنی دۆزەکەت، بەر لەوەی وەلام بدەیتەوە پرسیار لەبارەی وتەکانیەوە بکەی ئەگەر لێیان حالی نەبوی.

لەمیانەی هەمو ئەمانەدا هەوڵدە خاڵە هاوبەشەکانی نێوانتان بدۆزیەوە ئەگەر چی بچوکیش بن، تا بەڵکو لەوانەوە بەرەو لێکتێگەیشتنێکی گەورەتر و هاوڕابونێکی قوڵترەوە بچن.

**٣-قۆناغی بریاردان لەسەر رێککەوتن** لەبارەی هەرشتێکەوە. بەلام ئەگەر حالەتەکە بە بنبەست گەشت و نەگەیشتە رێگەچارەیەك، ئەوا پێویستە وتووێژەکە بوەستێنرێت و دۆزینەوەی ڕێگەچارەکە بۆ کاتێکی تر دوابخرێت.

**٤-قۆناغی هەڵسەنگاندن و توێژینەوەی ئامانجەکانی وتووێژەکە** و خۆسازدان بۆ وتوێژی تر-ئەگەر هەبن- و هەوڵدان بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکان.

شایانی باسە رەنگە گروپێکی تەواو و جیا لەوانەی وتووێژەکە/ئەنجام دەدەن، بەئەرکی سازکردن و پلانکێشان بۆ وتووێژەکە هەڵسن یان هەموی هەر ئەوانە بیکەن، کە گفتوگۆکە دەکەن و لەسەر مێز ئامادە دەبن.

* * *

## بەرەو پێش بردنی کار

ئەوانەی لەهەر کارێکدا ئەرکی کارگێڕیان گرتۆتە ئەستۆ، بەتایبەتی لەکارە بازرگانییە جۆراوجۆرەکان، یان بەشێوەیەکی وردتر لە دەزگا گەورە گەورەکاندا، پێویستیان بە پلانێکی دورمەودا و دەیان ساڵی هەیە بۆ ئەوەی کارەکانیان بەرەو پێشەوە بەرن و پەرەی پێبدەن و بەردەوام بەرەو ئامانجەکان و فرەوان کردنی کارەکانیان و گەیشتن بەرەو ئاسۆکانی کێبەرکێ و داهێنان و رانان لە پێشکەوتن دابن.

بەم پێیە هەمو ئەوانەی کە ڕوبەڕوی ئەم جۆرە کارانە دەبنەوە، پێویستە لە بیناکردنی دیدی ئایندەیی ئەو کارە شارەزا بن کە لەلای ئەودا گرنگی هەیە.

ئا ئەمەیە جیاوازی نێوان خاوەنانەی، کە پێشڕەو و بەردەوام و پێشکەوتون لەگەڵ ئەو خاوەن کارانەی، کە سەرکەوتنێکی سنورداری دیاریکراو وەدی دێنن و پاشانیش ناتوانن لەگەڵ تازەگەریەکانی زەمەن و وەرچەرخانەکانی ڕۆژدا بەردەوام بن و دادەمرکێنەوە.

جا فەرمو پوختەی هەندێ لەو تۆژینەوانەی، کە هەندێ لە پسپۆڕانی ئەم بوارە ئەنجامیان داوە، بەسود وەرگرتن لە هەندێ بابەتی وەرگێڕدراوەوە:

### جیاوازی نێوان نەگۆڕ و گۆڕاو لە ئامانجەکاندا:

مرۆڤ بەشێوەی تاك یان کۆمەڵ هەر کارێکی دەیکات، یان ئەنجامی دەدات دەبێ مەبەست و ئامانجێکی لەکارەکەدا هەبێ. مەبەست و ئامانجەکانیش هەیانە نەگۆڕ و هەمیشەییە، جا تا کارەکە مابێ ئەویش دەمێنێ، هەشیانە گۆڕاوە و بەزەمەنێکی سنوردارەوە پەیوەستە و کە هاتەدی ئەوا بۆ ئامانجێکی تر دەپەڕێتەوە.

ئامانجە قۆناغئامێزەکان وێستگەن لەسەر ڕێگای هەوڵدانی بەردەوامدا بۆ وەدیهێنانی ئامانجە هەرە بەرز و گەورەکەدا. یەکەمین مەرجی بیناکردنی دیدی ئایندەیی بریتیە لە جیاکردنەوەی ئامانجە نەگۆڕ و هەمیشەییەکان، کە هەردەم هەوڵی زیادکردنی بۆ دەدەی لەو ئامانجە قۆناغئامێزە گۆڕاوانەی، کە لەگەڵ کۆتا هاتنی قۆناغێکی دیاریکراوەوە کۆتایی دێت.

## پێناسەکردنی دیدی ئایندەیی:

بریتیە لە پیشکەوتنێکی بەردەوامی گۆڕاوەکان لە پێناو وەدەستهێنانی زۆرترین و پاراستنێکی هەمە لایەنەی نەگۆڕەکان.

بەم پێودانە پێویستیمان بەوە هەیە، کە لە بارەی نەگۆڕەکانی کار بدوێین، کە چ واتایەکمان پێ مەبەستە، پاشانیش لەبارەی گۆڕاوەکانەوە بدوێین.

## بەها و ئامانجە هەمیشەیی و نەگۆڕەکان:

هەمو کارێك کە دەکرێ ئامانج و مەبەستێکی بەردەوامی هەیە، کە لەگەڵ بەردەوامێتی کارەکەدایە. ئەم مەبەست و ئامانج و بەها نەگۆڕانە هەڵبەت ژمارەیان کەمە، بەڵام ئەوپەڕی گرنگییان هەیە و دەبنە مایەی ئاڕاستەکردن و پاساوی بونی کارەکە لە هەمو شوێن و کاتێکدا. جا فەرامۆشکردنی ئەم مەبەستە، یان ئەو ئامانجە واتای کۆتا پێ هێنانی دەسبەجێیە بۆ هەرچی پاساوی بونی کارەکەیە.

با وێنەیەکی وا بێنینەوە کە گشت موسڵمانێ لێی تێبگات و دەڵێین: مەبەست لەبونی مرۆڤ پەرستنە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾الذاريات/٥٦.

ئەگەر ئەم مەبەستە وەلاوەنرا و مرۆڤ خوای نەپەرست، ئەوا یان دەسبەرداربونە لە تەواوی پەرستن، یان پەرستنی غەیری خوایە. ئەو کات بونی مرۆڤ هیچ واتایەکی نابێ و هەرگیز پاساوێکی بۆ نامێنێتەوە.

ئەم ئامانج و مەبەستەش بەردەوامە لەگەڵ بەردەوامبونی ژیان.

ئەم ئامانجە لەو نەگۆڕانەیە کە هەرگیز گۆڕانی بەسەردا نایەت. ﴿وَاعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ: تا مردن پێت دەگا هەر پەروەردگارت بپەرستە﴾الحجر/٩٩.

جا ئەگەر بمانەوێ ئەم شتە لە جیهانی کاردا پراکتیزە بکەین، ئەوا بۆ نمونە دەڵێین: ئەگەر کۆمەڵە کەسێك کۆمپانیایەکیان بۆ کارێك لە کارەکان دامەزراند، ئەوا دەبێ زۆر بەڕون و ئاشکرایی ئامانج و مەبەستێکی بەردەوامیان لە هزردا بێ لەگەڵ بەردەوامێتی کۆمپانیاکەدا هەر بمێنێ. گریمان کۆمپانیاکە تا (٥٠) ساڵ بەردەوام بێ، نابێ ماوەی وەدیهاتنی ئامانج بریتی بێ لە (١٠) ساڵ و پاشان سۆراخی ئامانجێکی تر بکرێ، چونکە ئەو کاتە بە نەگۆڕی نامێنێتەوە و دەبێتە یەکێك لە گۆڕاوەکان.

ئامانجە نەگۆڕەکان دەبێ رابەرێکی هەمیشەیی هەبێ بۆ هەمو ئەوانەی، کە لە کۆمپانیاکە کار دەکەن، وەکو ئەستێرەی جەمسەر بێ کە ڕێبواران بەرەو باکور دەڕۆن هەمیشە لەبەر چاویانە. ئامانجی نەگۆڕی بەردەوام بۆ هەر کارێك دەبێتە مایەی بەیەکەوە گرێدانی دەزگاکە و یەکبونی کرێکارەکان بۆ وەدیهێنانی ئامانج و مەبەستەکان.

ئامانجە نەگۆڕەکان نوێبوەوەن بەو واتایەی، کە هەمیشەیین و بەردەوامن. وەك پێشتریش وتم پێویستە ژمارەشیان کەم بێ چونکە زۆرێتی نیشانەی گۆڕاوێتین، لە دنیای کاردا ڕەنگە ژمارەشیان نەگاتە چوار ئامانج کەم جار هەیە بگاتە شەش.

بەم پێیە دەبێ جیاوازی بکرێ لە نێوان مەبەستە جەوهەری و هەمیشەییەکان لەگەڵ شارەزاییە کرداری و پلان و ڕێوشوێنە گشتیەکانی کارەکەدا.

مەبەستە نەگۆڕەکان دەبێ لەمەڕ ئەزمونەکانی زەمەن خۆڕاگر بێ. پێویستە ئەم پرسیارە بخەینە سەر هەمو ئەو مەبەستانەی، کە کارەکەت دیاری دەکەن: ئایا دەکرێ ڕۆژێك لە ڕۆژان دەسبەرداری ئەم مەبەستە ببم و کارەکەشم بەردەوام بێ؟.

ئەگەر وەڵامەکە بە بەڵێ بێ، ئەوا ئامانجەکە یان مەبەستەکە لە پەیژەی نەگۆڕەکان دابەزێنە و بیخە ناو خانەی گۆڕاوەکانەوە، کە بۆیان هەیە بگۆڕێن و پێشکەوتن بەخۆیانەوە ببینن. یەکێك لەو ڕێگە پەیڕەولێکراوانەی، کە بەهۆیەوە مەبەست و ئامانجی ڕەسەنی دەزگاکەت، یان کارەکەتی پێ دەناسی ئەوەیە، کە وەسفی کارەکەت بکەیت و پاشان بەوشەی بۆچی پرسیار بکەیت و، پاشان پرسیارێکی تر بکەی کە وەڵامت دایەوە بۆ پێنج جار ئەم پرس و وەڵامە دوبارە بکەیتەوە.

بۆ نمونە دەتوانی بڵێیت: ئێمە لە کۆمپانیادا کارمان ئەوەیە کە خزمەتی کرێکاران بکەین لەو بوارەی، کە ماڵەکەیان خاوێن دەکەینەوە، بۆچی؟ تا بەشداربین لە تەندروستی گشتی. بۆچی؟ بۆ پێشخستنی ژیاری نەتەوە. بۆچی؟ تا هێز و چالاکی ژیانی پتر بێ. بۆچی؟ تا مرۆڤایەتی بەختەوەر بێ. بۆچی؟ تا ڕەزامەندی خوا وەدەست بێنین.

کەواتە دەتوانی بڵێی: ئامانجی ڕەسەنمان ئەوەیە، کە ڕەزامەندی خوا وەدەست بێنین لەمیانەی ئەو کارانەی کە لە وەڵامەکانی پێشودا ئاماژەمان پێ دان. یان دەتوانی بڵێی: دەزگاکەمان لە بواری کۆمپیوتەردا ئەرکی مەشق و ئامادەسازی گرتۆتە خۆ، بۆچی؟ تا

تاکەکانی کۆمەڵگە سود لــە بەرهەمــە ژیارییــە[1] هاوچەرخــەکان وەرگــرن. بۆچــی؟ تــا بەشداربن لە بەهێزکردنی نەتەوە. بۆچی؟ تا دوژمنان بەسەریدا زاڵ نەبن. بۆچی؟ تــا بــە سەربەستی بژین. بۆچی؟ تا ئاسودەیی وەدەست بێنین. کەواتە ئامانجی ڕەسەنی دەزگاکــە بریتی دەبێ لە گەڕان وەدوای ئاسودەیی خەڵکی.

بەم پێیە تۆ پێت وایە زیــادبونی پــارە و پــول ناگونجــێ ببێتــە ئامــانجێکی ڕەســەنی هەمیشەیی. چونکە ڕاستەقینەی پارە و پول ئەوەیە، کە هۆ(وســـیلە)یــە نــەك ئامــانج. کاتێکیش ئامانج و مەبەستەکە ڕاست و دروست بون، ڕەنگە پارە و پول وەدەست بێنــێ و ڕەنگە لەپێناو خواشدا بیبەخشیەوە.

مەبەستی نەگۆڕی ڕەسەن بریتیە لە سەرچاوەی ئیلهام و ڕێشـــنایی کرێکــاران، نــەك نیشانە جیاکەرەوەکانی دەزگاکــە. ڕەنگــە لــە ئامــانجی کۆتــاییدا گــەلێ لــە دەزگاکــان لەگەڵتدا یەك بگرنەوە، بەڵام بە ڕێگا و ئــامرازی جیــاواز، بــەڵام جیاکاریەکــە بــەهۆی ڕاستگۆیی و قوربانیدان لە پێناو وەدیهێنانی ئامانجە ڕەسەنە نەگۆڕەکەوە دەبێ.

یەکێك لە ســـودەکانی دیــاریکردنی ئامــانجی **نــەگۆڕی دەزگاکــە ئەوەیــە، کــە ئــەو** کەسانەی هەمان بەها و ئاواتی گونجاویان **لەگەڵ ئامانجە نەگۆڕە ڕەسەنەکەی دەزگاکــەدا** هەیە؛ کەمەندکێش دەبن بۆ کارکردن **لە دەزگاکەدا، ئەوانی تریش کــە خــاوەنی بــەها و** ئامانجی جیاوازن لەگــەڵ ئامــانجی **دەزگاکــەدا، ناچــارن دەزگاکــە جێبــهێڵن و ســۆراخی** دەزگایەکی تر بکەن.

## ئامانج و مەبەستە قۆناغئامێزەکان:

دام و دەزگا لەپێناو گەیشتن بە ئامانجی نەگۆڕدا چەند ئامانجێکی قۆناغئامێز دیاری دەکات، پاشان بەشێوەیەکی سەربەرەوژور ڕیزیان پێ دەبەستێ؛ ئینجا دەست بە ئامانجی یەکەم دەکات و وەسفێکی وردی پابەند بەو ڕێکخەرانــەی پێدەبەخشــێ، کــە لــە یەکــەم جێباسی ئەم کتێبەدا باسمان لێوەکــردوە، هــەروەها توانســتە بەردەســتە پێویســتەکان و ماوەیەکی زەمەنی گونجاویشی بۆ دیاری دەکــات. پاشــان دەســتەی کارمــەندان ئامــانج ئامانج قۆناغەکان دەبڕن و لە هێڵی کۆتایی نزیك دەبنەوە.

---

[1] ژیاری: شارستانی، حضاري .

دەبێ ئامانجەکە بەشەکی[1] و لەهەمان کاتیشدا واقیعی بێ، کۆمپانیا جیهانیە گەورەکان لەماوەی هەمو دەساڵ تا سی ساڵدا یەك ئامانجی گەورە و سەخت و بوێرانە بۆ خۆیان دادەنێن و پاشان لەمیانەی ئەوەوە بەرەو وەدیهێنانی چەقە ئامانجە نەگۆڕەکەیان هەنگاو هەڵدەگرن، پاشان دەچنە سەر ئامانجێکی قۆناغئامێزی ترەوە و پاشان بۆ یەکێکی تر و بەمجۆرە تا ئامانجی کۆتایی.

بەجیاکردنەوەی نەگۆڕ و گۆڕاوەکان کارەکەت پێشکەوتن بەخۆیەوە دەبینێ و دەتوانی بەشێوەیەکی رێژەیی ئایندەی دوری کارەکەت ببینی و بتوانی لە پلانەکانتدا رەفتارێکی وایان لەگەڵدا بکەیت، وەك بڵێی ئێستاکە لەبەر دەستت بێ و هاتبێتە دی.

یەکێك لە ترسناکترین ئەو شتانەی کە روبەروی پلاندارێژان دەبێتەوە ئەوەیە، کە لە کاری دەزگاکانیاندا نەگۆڕ و گۆڕاوەکان تێکەڵ دەکەن. جا یان لە ئامانجە نەگۆڕ و هەمیشەییەکانیان دادەبەزن و دەیخەنە بەر گۆڕانکاریەوە، کە ئەو کاتە دەزگاکەیان پاساوی بون و فاکتەری بەردەوامیێتی لە دەست دەدات.

وە یا سیفەتی نەگۆڕی و بەردەوامیێتی دەداتە پاڵ ئامانجە گۆڕاوە قۆناغئامێزەکان و دەزگاکەیان بنبەستب دەکات و دەپوکێتەوە تا لە کۆتاییدا لەنێو دەچێ.

مەترسیەکە لەوەدایە کە ئەوانە دوای ئەوەی لە وەدیهێنانی ئامانجێکی قۆناغئامێز دەبنەوە و لەوێدا دەوەستن و بەدەوری خۆیان دەخولێنەوە، ئیتر هەر سەربردەی سەرکەوتنەکانی پێشانیان باس دەکەنەوە.

رەنگە دیاریکردنی ئامانجە قۆناغئامێز و هەندەکیەکە سەرکەوتو بێت، بەڵام مەودای پابەست بون بە هەوڵ و تێکۆشان بۆ وەدیهێنانی ئامانجەکە لاواز بێت؛ بۆیە هەمدیسان توشی سەرنەکەوتویی دەبێت.

وریابە دەزگاکەت بگاتە لوتکەیەك لە لوتکەکانی سەرکەوتن، کەچی تۆ هێشتا لوتکەیەکی ترت دەسنیشان نەکردبێ تا بۆی بەرز بێتەوە، بزانە کە دیدی ئایندەیی یەکێکە لە گرنگترین مەرجەکانی سەرکەوتنەکەی و رێگای گەیشتنیش بریتیە لە عەقلە داهێنەر و جێبەجێکارە خوێن گەرمەکان و رێکخستنی رێکوپێك. جا هەر چەندی ئەم شتانەی لێ هاتەدی، ئەوا کاروانەکەت بۆ ماوەی دەیان ساڵ لە پارێزیدا دەبێ.

* * *

---

[1] بەشەکی: جزئي.

# هەڵوەستەی ماڵئاوایی

خوێنەری بەڕێز.. من هەر مەبەستم بــوە دڵســۆزیەکەت لـە ئاســتدا بنوێنــم و لــەو پێناوەش هەوڵم بۆ داوی، جا ئەگەر شتی راست و دروستم رانواندبێ، ئەوا فەزڵەکەی بــۆ خوا دەگەڕێتەوە، خۆ ئەگەر هەڵەشم کردبێ ئەوا داوای لێبوردن لەخواوە دەکــەم و تــۆش چاکی بکەوە و هیوام وایە لێم نەکەی بە هەرا و لە ئامۆژگاریــەکان بێبــەشمان نەکــەی و لەپاش ملەش دوعای چاکمان بۆ بکەی.

ئاواتە خوازم دوای ئەوەی کە لە خوێندنەوەی ئەم نوســراوە بویتــەوە توانــای ئــەوەت وەدەست خستبێ، کە بەچاکی ئامانجەکانت دروست بکەیت و هەوڵت دابێ بــەهۆی پــلان دارشتنت بۆ کاروبــاری ژیــانت و چاکــتر بــەکارهێنانی کاتەکــەت ژیــانت رێکخســتبێ، توانیبت خودی خۆت بخەیتە ژێر رکێفەوە و بەباوەڕی و ســەرکەوتنەوە بــەرێوەی ببــەی و بالاٚتر بی لەو رەخنانەی دەوروبەرەکەت ئاراستەت دەکەن و تەرکیزێکی زەینی و هزریــت هەبێ و سوربی لەسەر هاوسەنگی ژیانت و توانات هەبێ لەســەر دانــی بڕیــارە راســت و دروستەکان و بــەهرە هزریــەکانت بــەهۆی خوێندنــەوە ســەرکەوتو و سودبەخشــەکانەوە پەرەپێدا بێت و لایەنی تەندروستیت فەرامۆش نەکردبێ و بتوانــی بــەردەوام هاوڕێیــەتی خەڵك بکەیت و کاریان تێ بکەی و پەیوەندییان لەگەڵدا ببەستی دوای ئەوەی کە جــۆر و سیفەتیانت ناسی.

ڕەنگە ئەمە رێبەریت بکات تا لە کارەکەتدا سەرکەوتن بێنی دوای ئەوەی کە ئەگەر مەرجەکانی تەواو بکەیت و بەشێوەیەکی باش بــەرێوەی ببــەی و بــالاٚ دەســت بیــت لــە رەفتــارکردن لەگــەڵ کێشــەکانی کاربەخشــینەوە و کۆبونــەوەکان و رەفتــارکردن لەگــەڵ هاوکارە هەڵەپاسەکانت[1]، بۆ ئەوەی هەمو ئەمانە ببنــە مایــەی بەرزکردنــەوەی راددەی بەرهەمــهێنان و توانــابونت لەســەر وتووێژکــردن و بینــاکردنی دیــدی ئــایندەییت بــــۆ کارەکەت.

جا ئەگەر هەمو ئەمانە، یان هەندێکیانت لێ وەدی هێنــا، ئــەوا باشــە و نەفســیش

---

١ هەڵەپاس: هاروهاج .

ئەمە دەخوازێ، بەڵام ئەگەر بەهیچ شتێ لەمانە نەگەیشتی، ئەوا جارێکی تریش هـــەوڵ بدە، تا بەڵکو پێیان بگەیت.

خوا چاودێرت بێ و نیعمەتەکانی خۆیت بەسەردا بڕێژێ و لە ئێمەش و لەتۆش خـۆش بێ. خوایە سوپاس و ستایش هەر بۆتۆ لە سەرەتا و لە کۆتاییدا، زمان هەر بە سوپاسـی تۆوە پاراوە و قەڵەمیش هەقڕێژە. ستایش نیعمەتێکی سودبەخشە لەلای تۆوەیە خوایـە، بێ ئەژمار سوپاس و ستایشت دەکەین وەکو خۆت ستایشی خۆت کردوە.

*　　*　*

# ناوەڕۆك

لە میانەی رامان لە ژیان و تێکەڵبون لەگەڵ خەڵکی و هەوڵدان بۆ یارمەتیدانیان، بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانیان و هاوخەم بونم لە کۆسپ و تەگەرەکانی ژیانیان و خوێندنەوەی هەندێ لە نوسراوەکانی ئەو بوارەوە و تۆمارکردنی هەندێ لە هەست و نەستەکانم و لە کاتی جۆراوجۆردا، ئەم وشانەی لەم کتێبەدا نوسراون هاتونەتە بەرهەم، کە بەهومێدم یاریکار بێ لە چارەسەرکردنی هەر گرفتێك و لابردنی هەر تەگەرەیەکی سەر رێگە و، ببێتە مایەی زیادبونی کارلێك و، جموجۆڵ خستنی لەکارکەوتوان و وشیاربونەوەی نوستوان.

ئەم هزرانە بریتین لەو سود و بەهرانەی، کە لە ئەنجامی خوێندنەوە و ئەزمونە واقیعیەکانی ژیانەوە وەرگیراون، هەوڵم داوە -بەپێی توانا- هەر هەمویان لەبەر رۆشنایی سروشەوە رابنوێنم، تاوەکو ناراست و نارەواکانی لێ داوەشێنم و، رەوا و راستەکانیشی تێدا بهێڵمەوە، یا لەبەر رۆشنایی عەقلی بێگومان لە تەرازویان بدەم و لەگەڵ ئەمانەشدا رەچاوی سوننەتەکانی خوام کردوە، کە ژیان و بونەوەری پێ هەڵدەسورێ.

ئەم هزرانەی نوسراونەتەوە لەگەڵ ئەوەی کورتیشن، بەڵام مرۆڤی خاوەن هزر و رێبیر و هەڵگری پەیام و خاوەن دۆز دەتوانێ لێیان بەهرەمەند بێت. هەروەها فەرمانبەری سەرۆك و ناسەرۆکیش دەتوانن سودی لێ وەرگرن.

تەنانەت تاکەکانی خێزانیش: ژن و مێرد و باوك و کوریش دەتوانن سودی لێ وەرگرن.

ئەوانەی خاوەن کار و پارەدار و وتوێژکار و گفتوگۆکار و پلان دارێژیشن و ئەوانەش کە لە دلساردی و بێهومێدی دەترسن، یان توشی خۆ بەگەورە زانین و لوت بەرزی و شتی تر بون، دەتوانن سودی لێ ببینن.

بەڵام بەو مەرجەی هزرەکان بکرێنە کردەوە و هێدی هێدی پراکتیزە بکرێن و، هەر هزرە و لە شوێنی خۆی بەکار بهێنرێ و نەخۆشیەکان بە راستەقینەیی چارەسەر بکرێن . سەرکەوتنیش هەر بریتیە لە هێز و هەق و ورە بەرزی و خۆراگری، هەرەسیش بریتیە لە ناڕەوا و دەستەوسانی و ورە بەزیوی و ڕاشێواوی.

دکتور عوض محمد القرني

لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتی گشتی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر
ژمارە ٢١١ ساڵی ٢٠٠٣ ی دراوەتێ.